پرۆژەی ڕێکخراوی راسان – بەهاوکاری ڕێکخراوی
چاودێری مافی مرۆڤی کورد – (KHRW)

# ژن
# لە جیهانی سێیدا
## ئامانج _ بیرو ڕاکان

نوسینی / د.حەسنە بیجوم
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە :
چروو سابیر





ناوی کتێب: ژن لە جیهانی سێیدا (ئامانج- بیرو ڕاکان)
نووسینی :د. حەسنە بیجوم
وەرگێڕانی : چروو سابیر
نەخشەسازی بەرگ: فەرهاد مەلا حەسەن
ڕێکخستنی تێبینی و سەرچاوەکان : هەڵکەوت سەعید
نەخشەسازی ناوەوە : مەهدی بەکر
تیراژ: 500دانە
چاپخانەی: ئازادی _ سلێمانی
ژمارەی سپاردن: لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری _ بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (1295) ساڵی 2007 ی پێدراوە

# پێشەکی

میژوو، سەرەتای بزوتنەوەی ژنان لە ڕۆژئاوا دەگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی 1792، ئەو کاتەی (ماری وڵستن گرافت) یەکەم کتێبی خۆی لە ئینگلتەرا بەناوی (بەرگری لە مافەکانی ژنان) بڵاوکردەوە، لەو کاتەوە ژنانی ڕۆژئاوا خەبات دەکەن لە پێناو گەیشتن بە تەواوی مافەکان و یەکسانبونیان لە مافەکانیانداو دانانی یاسایەکی دادپەروەر، ئەوەش بووە هۆی گۆڕانێکی ریشەیی لەباری کۆمەڵایەتی و یاساییان. کەواتە بزوتنەوەی ژنان لە ڕۆژئاوا گۆڕانێکی گەورەی هێنا ئاراوە کە لەگەڵ هاتنە پێشی سیستمی دیموکراسی شان بەشانی بانگەشە کردن بۆ ئازادی و ڕەخساندنی هەل یەکسان بۆ هەموان بە بێ گوێدانە چین و تایەفەو بیرو باوەڕو ڕەگەز .

لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەناوچەیەکی ڕۆژئاوای ئاسیا (هەرێمی بەنگال لەسەردەمی حوکمی بەریتانیەکان) هەندێك لە هندیە بەنگالیەکان، ئەوانەی کە پەروەردەو فێربونی ڕۆژئاوایان وەرگرتبوو، ، دەستیان کرد بەبانگەشەو بەرگریکردن لە مافەکانی ژنان. هەروەك هەندێ چاکسازی کۆمەڵایەتییان کرد بەمەبەستی لەڕیشە هەڵکەندنی دیاردە دزێوە کۆمەڵایەتییەکان کە ژنانی کردبووە قوربانی کۆمەڵ. دواتر ئەو هەوڵانە بەتێپەربونی ساڵ لەبزوتنەوەیەکی چاکسازی کۆمەڵایەتیەوە گۆڕا بۆ بزوتنەوەیەکی تایبەت بە رزگاریخوازی ژنان. بەم جۆرە ئەم بزوتنەوەیە لە کۆمەڵگەی هندی لەبەنگالدا بووە هێزێکی کاریگەرو چالاك کە بەمەش توانی هەندێك لە باری خراپی ژنان لە رووی یاسایی و کۆمەڵایەتیەوە چاك بکاتەوە. بەڵام لەبەرانبەر ئەوەدا کۆمەڵگەی بەنگالی موسوڵمان بەدواکەوتوویی مایەوە لەبەر پایەند بونیان بەداب و نەریت و کەمی دەرفەت لەباسکردنی کێشەی خۆیانەوە ,بۆخستنەرووی کێشەی ژنانی



موسوڵمان لەبەنگالیدا ، هەوڵی ژنێکی وەك(بیجوم روقیە سەخوات حوسێن (1880 – 1932) دیارو هەڵکەوتوو بوو، کە بە نوسینە بوێرو لیبراڵەکانی لەمەڕ ئازادی ژنان لە کۆمەڵگەی هاوچەرخدا دەنگی دایەوە و رێگای بۆ ژنانی موسوڵمانی بەنگالی کردەوە بۆ پێشکەوتن و گەشەکردن کە تائێستاش کارە فەلسەفییەکانی کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی هاوچەرخی ژنانی بەنگالیدا هەیە.

بزوتنەوەی ژنانی بەنگالی لەماوەی حوکمی پاکستانیدا ئامانجی زۆرو گەورەی بەدەست هێناوە، بەڵام کۆمەڵی ئیسلامی پێشترو ئێستاش دوورە پەرێزە لەبەرانبەر بیرکردنەوەی پێشکەوتوو و نوێ . نەك هەر ئەوە بەڵکو بەهۆی داب و نەریتی باوی کۆمەڵایەتیەوە هیچ کاتێك هانی بیری یەکسانی تەواوی نەداوە، هەروەك چۆن لە کۆماری ئیسلامیشدا بە هیچ شێوەیەك هانی بزووتنەوەی ژنان نەدراوە.

دامەزراندنی دەوڵەتی بەنگلادیش لە ساڵی 1971 هاندەرێك بوو بۆ بیری ئازادی ژنان. لەبەرئەوەی دەستوری بەنگلادیش لە رووی تیۆرییەوە مافەبنەڕەتیەکانی هاوڵاتیانی بە بێ گوێدانەجیاوازی خێڵ و چین و رەگەزو بیروباوەڕ ، داوە .ئەمەش بۆتە هاندەرێکی گەورە ، بۆ بزووتنەوەی ژنان لەو وڵاتەدا. ژنان لەبەنگلادیشدا چەوساوەی یاسای خێزانن کە جیاکاری دەخولقێنێ و لەژێر ئەو بارەدا ژیانی کۆمەڵایەتی رۆژانەیان دەگوزەرێنن و بەدەگمەن هەلی فێربوون و هەڵبژاردنی پیشەیان بۆ دەرەخسێ، لەلایەکی تریشەوە رەوشی نالەباری کۆمەڵایەتی و ئابووری کاری لە ژیانی ژنان کردووە، بۆیە نکوڵی لەوەدا ناکرێ بەهۆی نەبوونی یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئەو یاسایانەی کە لەسەر جیاکاریی رەگەزی و ئایینی دامەزراون کە ژنان زیاتر دەچەوسێندرێنەوە بزوتنەوەی ژنان لەو وڵاتەدا ئامانجی گۆڕینی ئەو بارو دۆخەیە بەگشتی.

ئەوەی مایەی هیوایە بوونی کۆمەڵێك ژنی خوێندەوارە کە لەپێشەنگی بزوتنەوەی ژنانی بەنگالیدا کار دەکەن مامۆستاو دکتۆر (حەسنە بیجوم) یەکێ لەو ژنانەیە کە لەوبوارەدا و لەهەردوو لایەنی تیۆری و

پراکتیکدا کاردەکات. یەکێك لەبەرهەمە بەپێزەکانی ئەم کتێبەی بەردەستتە کە لە لەم کتێبەدا (النساء في العالم النامی – أفكار و أهداف) دکتۆر حەسنە بیجوم چەند توێژینەوەیەك دەخاتە روو سەبارەت بە فەلسەفەی بزوتنەوەی ژنان و گوزەرانی ژنان لەبەنگلادیش و باری یاسایی و کۆمەڵایەتی ژنانی ئەو وڵاتە ، بوونی ڕەوتە ئیسلامیەکانی دژ بەم بزوتنەوەیە، بیروباوەری کۆمەڵایەتی سەلەفی دژی ئازادی ژنان،.....هتد, هەروەها هەوڵی پێشکەشکردنی بنەمایەکی تێوریی دەدات بۆباشکردنی بارو گوزەرانی ئەمڕۆی بزوتنەوەی ئازادیخوازی ژنان لە بەنگلادیش ، کە دیارە خانمی نوسەر لەو پەیامەشدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

لەدوو دەیەی دواییدا کۆمەڵێك کتێب و بەرهەمی ژنان لە بەنگلادیش بڵاوکراونەتەوەن , لیستێکیش بە ناوی بەشێك لەو کتێبانە لە کتێبی (مراجع عن نساء بنجلادش) دا بۆ ئەو خوێنەرانەی بایەخ بەم بابەتە دەدەن, هەیە کە خانمی دکتۆر مەحمودە ئیسلام لە (دەككا) لەساڵی 1979 دا بڵاوی کردۆتەوە. بێگومان کتێبەکەی دکتۆر بیجومیش سەرچاوەیەکی گرنگە لەسەرچاوەکان کە بەبۆچوونی من دەوڵەمەند کردنی کۆی ئەو نوسینانەیە لەبارەی بزوتنەوەی ژنان کەلەباشوری ئاسیادا نوسراون, لەبەر ئەوەی رەنگدانەوەی هیواو خواستەکانی بزوتنەوەی ژنانو بۆچونەکانیەتی لە باشوری ئاسیا بەگشتی .

من هەست بەشانازی دەکەم کەدەرفەتم پێدرا، پێشەکی بۆ ئەم کتێبە بنووسم، هیوادارم لەلایەن بایەخدەران بەبابەتەکەوە بەرز بنرخێندرێت .

**شەهنا را حسێن**

**مامۆستای بەشی مێژووی زانکۆی**

**رەجشاهی لە بەنگلادیش**





## دەستپێك

ئەمرۆ لە دونیای هاوچەرخدالە رۆژهەڵاتو رۆژئاوا ، داخوازی ئازادبوونی ژنان لەبەرزبوونەوەدایە کە هەرچی پیاوان و ژنانی ئازادیخوازیش هەن پشگیریی لە یەکسانی مرۆڤەکان دەکەن بەژن و پیاوەوە ، وەك چۆن لە سەدەکانی ڕابردوودا باوبوو چیتر بیرۆکەی کۆیلەبوونی ئافرەت پەسەند ناکرێت چونکە ئەمرۆ ژنان بە ئامادە بوونیان دەتوانن شوناسی ونبووی خۆیان وەکومرۆڤ بەدەست بهێننەوە.

ئەم پێشکەوتنەش لەبنەڕەتدا بۆ کۆمەڵێك هۆکار دەگەڕێتەوە : پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا , سەرهەڵدانی عیلمانیەت، بڵاوبونەوەی خوێندنەواری .... هتد.

ئەم لێکۆلینەوەیە هەشت بەش.. لەخۆ دەگرێت. کەهەموویان فۆکس دەخەنە سەر گرنگی یەکسانی ژن و پیاو و بەهانەکانی ئەویەکسانیە. بیرۆکەی ئازادی ژنان بەرانبەر بەرهەڵستکارانیدا، رووبەڕووی گرفت دەبێتەوە , هەوڵم داوە قەناعەتیان پێ بکەم و لەبەر رۆشنایی فەلسەفەی ژناندا واتە مافەکانی ژنان لەیەکسانیدا, وام لێکردن تێروانینی من پەسەند بکەن .لەچواربەشی یەکەمدا ,هەوڵمداوە وەزعی ژنان و حاڵەتی تایبەتی ئەوان لە وولاّتانی کەم پێشکەوتوو بخەمەڕوو :

* ژنوکەناڵەکانی ڕاگەیاندن لە بەنگلادیش.
* بنەما مۆڕاڵەکانی ژن لە ئیسلامدا، شیکردنەوەی تێزی یەکسانی.
* بارودۆخی ژن لە ئەدەبی میللی بەنگلادیشدا.
* بیجوم روقیە :رابەری هزرخوازی .

**ئەگەر چی من بەنگلادیشم هەڵبژاردووە بۆ لێکۆڵینەوەکەم لەو بەشانەدا، بەڵام دۆخی ژنان هاوشێوەی بەنگلادیشە لەو وڵاتانەی کەوەکو ئەو کەمتر پێشکەوتوون.**

**هەوڵمداوە لەو سێ بەشەی خوارەوەدا :**

**. * ژن لە کتێبی سەوزی قەزافیدا.**

*** پەیوەندی ژن و پیاو لە ئەدەبی هاوچەرخی بەنگلادیشدا.**

*** ڤێرجینیا وۆلف و ئازادکردنی ژنان.**

**هۆکاری ئەو هەلومەرجە روون بکەمەوە کە لە ڕووی دەرونی و لۆژیکەوە بەهانە هەڵناگرێ. هەروەها بە شێوازێکی ڕەخنە ئامێز گفتوگۆم لەسەر ڕ او هەڵوێستی هەریەك لە بیجوم روقیا و ڤێرجینیا وۆلف و قەزافی کردووە و بەمەبەستی چەسپاندنی ئازادیی ژنان هاوپشتی بۆچونی ئەو دوو ژنە ڕابەرەم کردووە وڕەخنەشم لە ڕایەکانی سەرۆك قەزافی گرتووە.**

**لەدوا بەشدا(سیستمی بەشی رێژەیی دامەزراندن لەبەنگلادیش – پاساوە ئەخلاقیەکان) تەنیا باس لە مافی یەکسانی ژنان ناکەم، بەڵکو داواکاریشم ژنان لەو بوارە زیاتر سوودمەندتربن بۆ قەرەبوکردنەوەی مافە لەدەستچووەکانی سەدەکانی ڕابردوویان.**

**هەروەها دەمەوێ جەخت لەوەش بکەمەوە کە لەسەدەکانی رابردووەوە تاکو ئێستا ژنان بەدەست جیاکاری رەگەزیەوە نالاّندوویانە ,ئێستاش کاتی چاکردنەوەی ئەو زەرەرە زۆرەی ژنان هاتووە ئەویش بەبەدەست هێنانی مافی زیاترو زۆرتر بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو دواکەوتوییەی کە لەمێژەوە توشیان هاتووە.**

**ئامانجی ئەم نووسینە خستنە ڕووی بیروڕای جیاوازە بۆ خوێنەر دەربارەی ئازادی ژن وسڕینەوەی ئەو بیرو باوەرە کۆن و سواوانەی کە هەندێ جار دژی پێشکەوتنی ژنان بووە، هەروەك میراتگری ئەو ڕایانەی کە دژی یەکسانی ژنانن لەو ئەفسانانەی کە پیرەکانمان دەیگێڕنەوە، تابۆکانی ژن لە ڕووی ئایینی وئەو یاسایەی کە لەکۆمەڵدا پیادەدەکرێت ، هەروەها لەرێگەی ئەو چیرۆکانەی کە لە میانەیاندا ژن وەك ئامرازێك وێنا**



**دەکەن و لەڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بیری چەپاندنی ژن لە کۆمەڵدا بڵاودەکەنەوە.**

**ئامانجێکی دیکەی دەرخستنی مامەڵەی نایەکسانی نێوان ژن و پیاوە لە کۆمەڵدا، ئەگەر ئەو هەلەیان بۆ بڕەخسێت دەتوانن مافەکانی خۆیان بەدەست بێنن و وەك پیاو بەرپرسیاریەتی بگرنە ئەستۆی خۆیان ،چونکە ڕەخساندنی زەمینەو هەلی یەکسان مافی هەموو مرۆڤێکە چ ژن بێ چ پیاو.**

**وەك نووسەری کتێبە کە دڵنیام بۆ مەسەلەی ئازادی ژن گۆشە نیگای جیاواز هەیە، لێرەدا یەك لەو گۆشەنیگا دیاریکراوانە دەخەمە بەرچاو کە ئومێدەوارم ئەم دەستپێکە کورتو وردە یارمەتیدەرێکی خوێنەر بێت بۆ تێگەیشتنی بیروڕا و بەهانە بەهێزەکان لەمەڕ بزوتنەوەی ئازادیخوازی ژنان.**

**دواجاریش حەزدەکەم سوپاسی هەموو ئەو کەسانە بکەم کە یارمەتیان دام لە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، دەمەوێ سوپاسی کوڕەکەم (قەیسەر سەلیم ) بکەم و خۆشەویستی خۆمی بۆدەربڕم. کە لە وەڕگێرانی چوار بابەتدا، لەزمانی بەنگالیەوە ، بەتایپ کردنیان، یارمەتی داوم ئەگەر ئەو نەبوایە، نەمدەتوانی لەماوەی چەند مانگی ڕابردوو ئەم کتێبە ئامادە بکەم. دەمەوێت سوپاسی بەرێز (هەبیبۆر ڕەحمان) بکەم، لە چاپ و پەخشی ئەکادیمییەکان دا (Academic Publishers) و بەرێز (س. ك – گای لەسترلینگ پوبلیشێرز)، بکەم کە یارمەتیاندام بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، ڕێزی زۆرم بۆ دکتۆر شەهنارا حسین مامۆستای مێژوو لە زانکۆی ڕەجشاهی کە داوام لێکرد پێشەکی ئەم کتێبە بنووسێ.**

**د. حەسنە بیجوم**

# پێشەکی

ژن لە جیهاندا خاوەنی پرسێکی گەورەو هەستیارە،ئەو پرسەی ژن وایکردووە ,بە درێژایی مێژوو ئەو ,نە خاوەنی نیشتیمان و نە خاوەنی مێژووش بێت . هەنگاونان بۆ زاڵ بوون وسەرکەوتن بەسەر ئەو کێشەیەدا، گەورەیی , رۆحی یاخیبووی ژنان دەنەخشێنێ لە بەرانبەر ئازارونەهامەتییەکانیدا.

ئەم کتێبەی بەردەست ،کە پرۆژەیەکی وەرگێڕانە، بەشێکی گەورە لە لایەنی ژیان و گوزەرانی وڵاتێکی وەکو بەنگلادش دەخاتەڕوو، نووسەری ئەم کتێبە کە خۆی داکۆکیکارێکە لە بواری ژنان، زۆر بە ووردی دەستدەخاتە سەر زام و چەوسانەوەکانی ژنان، هەروەها لەرێگەی گێرانەوەی چیرۆکەکانەوە, وێنەی ئەو ژیانەی کە ژنان لە بەنگلادش پێی مەحکومن دەخاتە بەر دەستمان . وە نەبێ پەڕاوێزخستن و دابڕانی ژن بە دنیای دەرەوە و کۆمەڵگە هەر تەنیا لە بەنگلادش هەبێت، بەڵکو لە هەر جێیەك یاساکانی ئایین و سیستمی پیاوسالاری هەبوو،کە سیستمێکیبارگاویی و کاریگەرە بەهێزی ئایینی و کلتوری توندوتیژی و تۆڵە سەندنەوە و سڕینەوەی رەگەزی بەرامبەری لە هەناویدا هەڵگرتووە.لە ژێر حوکمی ئاوها سستەمێکدا شتێك نامێنێتەوە بە ناوی مرۆڤبوونی ژن.

بێگومان ئەوەی زیاتر سەرنجی راکێشام بۆوەرگێرانی ئەم کتێبەلەو باوەرەوەیە کە:

1.پرۆژەی وەرگێرانی کتێبی تایبەت بە رەوشی ژنان لەزمانی میللەتانی دونیاوە, پێویستیەکی حەتمیە بۆپتر شارەزابوون بە مێژوو و کاروانی ئەو بزاڤ و جوولانەوە رزگاریخوازەی ژنان کە لەسەرتاسەری جیهاندا هەبوون ,دیارە بە وەرگێرانی ئەو بلاّوکراوەو کتێبانەش نەوەی ئێستاوداهاتووشمان پڕچەك دەبن بەبیری یەکسانی وئازادی ژنان .



2. ((بنەما مۆرالەکانی ژن لە ئیسلامدا_ شیکردنەوەی تێزی یەکسانی)) , بوونی ئەو بەشە یەکێك بوو لە هاندەرە بەهێزەکان بۆ وەرگێرانی ئەو کتێبە چونکە لە مێژوودا ئەو کتێبانە زۆر کەمن کە لایان کردبێتەوە لەو نایەکسانیە جەندەریەی لە ئایینی ئیسلامدا هەیە, کۆی ئەو نایەکسانیەش کە مانەوەیان تا ئێستا برەویداوە بە دەسەلاّت و هەیمەنەی پیاو لە(( خستنە ژێر پرسیارو گومان بۆ هەر جۆرە پەیوەندیەك ,کەژن و پیاو کۆبکاتەوە یاخود ئامانج لە بوونی ژن لە ژیاندا تەنیاخزمەتکردنی پیاوە وهەروەهاپەروەردەکرنی ژنان بە ئاراستەی پەراوێزخستن و دابران بە جیهانی دەرەوەی خۆی,و مافی پیاو لە هاوبەشبوونی ژنانی دیکە لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا , .....هتد)) دەردەکەوێت .

3.مەبەست لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەش بێجگە لەوەی بەرچاوڕوونییە بۆ خوێنەر بە تایبەت لە رەوشی ژنانی ولاّتێك کە لە سیستم و ستراکتوری کۆمەلاّیەتیدا هاوشێوەی ولاّتی خۆمانە، لە هەمان کاتیشدا وەك لە هەندێك بەشی کتێبەکەدا هاتووە، پیشاندانی رێگای زانستییە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان،

هیوادارم ئەو کتێبە رووناکیەك بخاتە نێوماڵی کتێبخانەی کوردی و هەروەك ئومێدیش دەکەم چیتر ئێمەی ژنان زێدەگاڤی ئەو نەهامەتییانەی خۆمان بکەین و ببین بە بەشێك لە مێژوو بۆداهاتوومان .

**وەرگێڕ**

# بەشی یەکەم

# ژن و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەبەنگلادیش

لەو کاتەوە کە بەنگلادیش سەربەخۆیی خۆی بەدەست هێناوە، کابینەی حکومەت چەند جارێك گۆڕاوە و تەنها سیان لەو سەرۆکانەی دەوڵەت توانیان بیروباوەڕی تایبەتی خۆیان بۆ ماوەیەکی باش تێکەڵ بەسیاسەتی فەرمی ئەو وڵاتە بکەن.

لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەت لەبەنگلادیش خەڵکی هەمووی بەهیوای گۆڕانێکی ڕیشەیی بوون لەبارو گوزەرانی بوارەکانی ژیانیان. بەڵام ئەو هیوایە زۆری نەخایاند پوچەڵ بووەوە، ئەویش بەهۆی گۆڕانی یەك لەدوای یەکی سەرۆکەکانی حکومەت بەلای دیکتاتۆریەت و پاوان کردنی دەسەڵات بۆ خۆیان. لەم ئەزموونەوە گەلی بەنگلادیش بۆی دەرکەوت کە سیاسەت تەنیا ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و پارێزگاریکردن لەو دەسەڵاتە،ئەمەش وایکرد کە هاووڵاتیانی ئەو وولاتە هەست بە توانایی خۆیان بکەن ، بێ باوەڕبوون لە چاکبوونی ژیانی ڕامیاری بەنگلادش کەلەوێوە بۆ باشترکردنی ئاستی گوزەران و ئاستی خەڵك کارێکی باشتر بەئەنجام بگەیەنن، هەرچۆنێك بێت ئەو پێشکەوتنەی لە وڵاتدا ڕوویدا دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵەکانی حکومەت بۆ هێورکردنەوەی هاوڵاتیان ئەویش کردنی هەندێ چاکسازی بوو بەبێ ئەوەی لە لایەن سەرکردە سیاسییەکانەوە نیەتێکی پاك و ڕاستەقینە لەودیوی ئەو چاکسازیانەوە هەبێت .

لەساڵی 1972 دا لەماوەی حوکمڕانی یەکەم سەرۆکی وڵات (شێخ موجیب ڕەحمان) چوارچێوەیەکی گشتی بۆ دەستور دانرا، ئەم دەستورە





لە بنەڕەتدا بە دەستورێکی لیبڕالی دادەنرێ چونکە پێ لەسەر مافی گشت و سوودمەندبونی گەل دادەگرێ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی چین ، ڕەگەز، یان بیروباوەڕ.

شێخ موجیب لەماوەی دەسەڵاتی خۆیدا گۆڕانکاری بنەڕەتی هێنایە کایەوە و هەستا بە : خۆماڵی کردنی هەموو پیشەسازییە گەورەکان ودامەزراوە بازرگانییەکانی وڵات(1). بەڵام هەردوو سەرۆکەکەی تر لەمێژووی دوای سەربەخۆیی بەنگلادیشدا ((زیاو ئیرشاد)) هەردووکیان وەکو دوو ئەفسەری سوپا شێوازێکی تەواو داگیرکەرانەیان هەبوو، بەمەبەستو بە ئاشکرا هەوڵیاندا هاوڵاتیان بێبەش بکەن لە موومارەسەکردنی سیاسی لەو وڵاتەدا ، هەردووکیان لەو شێوازەیاندا سەرکەوتوو بوون و توانیان کۆنترۆڵی وڵات بکەن و کاروانی پێشکەوتن بەرەو دیموکراسیەت بشێوێنن.

سەرباری ئەمەش بەرنامەی گەشەپێدان لەسەردەمی (زیاو ئیرشاد) دا بەبێ لێکۆڵینەوە وبەرنامەیەکی وردو تۆکمەی نەبوو ، زیا لەسەردەمی خۆیدا لە ئەنجامدانی هەڵکەندنی نۆکەندا پەلەی کرد چونکە بەبێ لێکۆڵینەوە لە دروستی و سەرکەوتویی و درێژخایەنی لە ئەنجامەکانی جێبەجێی کرد، هەروەها ئیرشادیش کاری بەجێبەجێ کردنی بەرنامەیەکی دیکە کرد کەناوچەلاوەکیەکانی لەخۆگرتبوو، ئەویش بەبێ ڕەچاوکردنی دەرەنجامەکانی. ئەمانە نمونە بوون بۆ تێگەیشتن لە هەوڵەکانی هەردوو سەرۆك لەپێناو مانەوەی خۆیان لەدەسەڵات کە لە ئاکامدا بەنگلادیش بەبێ هیچ بەرنامەڕێژیەك لەبواری گەشەپێدان و بنیادنان مایەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەبنەڕەتدا ئەو بەرنامەیە بەپێی حەزو ویستی گەورە سیاسیەکان بوو، ئەوانەی کە دەیانتوانی بە ئارەزووی خۆیان گاڵتە بە سیاسەت و ڕامیاری سامانی وولات بکەن لە ماوەی دەسەڵاتی خۆیاندا خۆ لە خەڵك گێل بکەنو لە زۆر ڕووەوە لە بەرامبەر ئارەزووکردنی گەل لە گەشەپێدانو چاکسازیدا.(2)

بێگومان ئێستا وڵاتێکی وەکو بەنگلادیش بەقەیراندا تیٚ دەپەڕێت، ( نووسەر مەبەستی کاتی دەرچوونی ئەم کتێبەیە _ و ) گرنگترین کاری پەلەش چاکسازیی کردنە لەبواری پەروەردە و فێرکردندا، بەتایبەتیش پەروەردەی گشتی بۆ ژیانەوەو بەرەو پێشەوە چوونی هۆشیاری ڕامیاری میللەت، ئەوەشی کە مایەی سەرسوڕمانە لێرەدا ئەوەیە، ئەم بەرنامە پەروەردەییە ڕاستەوخۆ دژی بەرژەوەندیەکانی چینی دەسەلاٚتدارە، بۆیە توانیویەتی نیمچە پارێزگارییەك بکات لە دەسەلاٚتی سیاسی خۆی ئەویش لەبەر نەفامی زۆرینەی خەڵك لەو وولاٚتەدا.

هۆیەکانی ڕاگەیاندن توانای دروست کردنی تێڕوانینی دروستیان هەیە لە نێو خەڵك بەگشتیو هەروەها توانای یارمەتیدانیان لە فێربونو خۆ رزگارکردن لە بیرو باوەڕی جادوگەری و خورافیات هەیە کە ئەوانی لاواز و ناهۆشیار کردووە.

هۆیەکانی راگەیاندن دەتوانن بیروبارەوری گرنگ پەخش بکەن لەبارەی زانستی تەندروستی و خۆراك و شێوازەکانی کشتوکاڵ کردنی پێشکەوتوو کە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی خەڵکی کەم دەرامەت. هەروەك پەروەردەو بواری فێرکردنی گشتی ڕەنگە بتوانیٚ لەنێو میللەتدا ئاگاییو هۆشیاری سیاسی بەئامانجی ژیانێکی پێشکەوتوو بخوڵقێنێت. لەئەنجامیشدا فەلسەفەیەکی ڕامیاری گونجاوی لێبکەوێتەوە لەمیانەی هۆشیاری گشتی کە خەڵکی هان بدات بۆ ئەوەی هەر یەکێك لە هەمووبوارەکانی ژیانیدا پشت بەخۆی ببەستێت.

هەروەها کەناڵەکانی راگەیاندن دەتوانن یارمەتی فێرکردنی گشتی خەڵك بدەن چونکە هەر سێکشنێك لە ڕاگەیاندن لەسەر ئاستی دەرونی توانای ئەوەی هەیە هاولاٚتیان بجولێنی بۆ پەسەند کردنی بیری نویٚ و ئاسۆی بیری پیٚ فراوان بکات، ئەگەر هاتوو بەباشی بەکار هات.

بەداخەوە کەناڵەکانی راگەیاندن لەبەنگلادیشدا ئەگەر چی وا سەدەی بیستەمیش تەواو بوو تا ئێستا هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم ئامانجانەیان نەداوە و کاریگەریان بۆسەر ناوچە دوورە دەست و لادێکان



کاریگەریەکی لاوەکییە, نەك ئەوەش بەڵکو بەنگلادیش بە هەموو شێوەیەك دوورە لە کەناڵەکانی پەیوەندی کردن.

پێناسەی (کۆمەڵگای خەڵك) خۆی لەو ئەندامانەیدا دەبینێتەوە، کە بە زۆرترین یاکەمترین ئاست ئاڕاستە دەکرێن لە میانەی پڕوپاگەندەی ئاڕاستەکراو بەجەماوەر لەرێگەی ڕاگەیاندنەکانەوە (ئێزگە، رۆژنامە و گۆڤارەکان، تەلەفزیۆن و سینەما). زۆرینەی گەلی بەنگلادیش هەژارو نەخوێندەوارن، ئەوان لەو سەردەمەدا دەژین، کەچی لەبیروباوەڕو پراکتیکی ڕۆژانەیاندا بۆ خەڵکانی سەدەی پانزەیەم دەگەڕێنەوە(3). ئەو هەژاریە کوشندەیە و بلاٚوبونەوەی نەخوێندەواریەکی زۆر لەنێو خەڵکیدا، بونەتە دوو هۆکاری گرنگ و بەرپرسیار لەبەرانبەر نەبوونی کاریگەریەکی پێویست کە دەکراکەناڵەکانی ڕاگەیاندن بە دەستی بێنێت لەپێناو گەشەکردنی کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتنخواز و دیموکراسی.

هەژاری زۆرینەی دانیشتوانی بەنگلادیش، کۆسپێکی گەورەو مەترسیداری لەرێگەی حکومەتدا دروست کردووە بۆ بەدیهێنان وپەیڕەو کردنی شێوازی بابەتیانە و ئەکتیڤ لەبلاٚوکردنەوەی خوێندن و نوسین لەنێو خەڵکی ئەو وولاٚتەدا، لەگەڵ ئەوەشدا گرنگی نەدان و بەرژەوەندیەکانی سەرکردەکانی دەوڵەت هۆکاری تری مانەوەی ئەمجۆرە دۆخەیە، کەمی زانست و هەژاری بازنەیەکی داخراوە کە بەهۆیەوە ڕەنگە مەحاڵ بێت بتوانرێت (کۆمەڵگەیخەڵك) دابمەزرێت، ئەو کۆمەڵگەیەی کە ئامانجی دابین کردنی ژیان و سامانی خەڵکە لەئێستاو داهاتوودا.

کۆمەڵگای بەنگلادیشی پیادەی سیستمێکی کۆمەلاٚیەتی دەکات کە ((پیاو سالاری))یە (4) ، لەبەر ئەوە ژنان لەو وولاٚتەدا بەبەردەوامی بیٚ بەشن لەماف و توانستەکانی خۆیان.ئەگەرچی ولاٚتەکەش لەڕووی ئابوریەوە ولاٚتێکی هەژارە، بەلاٚم بێگومان دۆخی ژیانی پیاوان کۆمەڵدا باشترە لە ژنان، ژنان لە مافە مرۆییەکانی خۆیان بێبەشن,ئەو بەپێی ئەو ئایینەی کە ئینتمای بۆ هەیە، بۆی نیە ببێتە میراتگر هەروەها مافی هەڵبژاردنی هاوسەری نیە، بەڵکو ئەو هەموو کات بەبیٚ ویستی خۆی

ملکەچی ئەو هەڵبژاردنە دەبیٚ کە بۆی دیاری دەکریٚ، بێجگە لەوە مافی جیابوونەوەی لە هاوسەرەکەی نیە تەنیا لە حاڵەتی زۆر ناوازەدا نەبیٚ.لە کاتی هاوسەر گیری, بەڵام ئەو مافەش بە هیچ شێوەیەك شتێکی کۆتایی نییە بەڵکو مێردەکەی بۆی هەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەو مافە ئەگەر ویستی، هەروەها ژنان مافی سەرپەرشتی کردنی مناڵەکانیان نیە. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە ئەو دەستورەی کە لەساڵی 1972 لەو وڵاتەدا دانراوە، لەڕووی تیۆریەوە ئەو مافانەی بەشێوەیەکی یەکسان داوە بە ئافرەت جگە لەو لایەنانەی کە پێشتر باسمان کرد.

ئاشکرایە کە پشتبەستنی ژن بە پیاو لەڕووی ئابووریەوە بێبەش بوونی لە ئازادی جوڵە کردن (بەهۆی دورە پەرێزیو فشارە کۆمەڵایەتیەکان) هەلی پێویستی بۆ نەرەخساوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە مافە دەستووریەکانی بکات.

هەروەها ئەم لێکۆلینەوەیە لە ئێستادا (5) ئاماژە بەنەبوونی هیچ کاریگەریەك لەلایەن هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە دەدات لەسەر ژنان، ئەم لێکۆلینەوەیە ئامانجی پێشکەشکردنی هەندیٚ بیروڕای دیاریکراوە لەوانە:

– چی پێویستە کە هۆیەکانی ڕاگەیاندن بیکەن ؟

– هۆیەکانی ڕاگەیاندن چۆن دەتوانن گۆڕانکاری نویٚ و پێویست لە هەلومەرجی یاسایی ژنان, لەبەنگلادیشدا بکەن ؟

ئامانجێکی تری ئەم لێکۆلینەوەیە، سەلماندنی ئەو ڕاستیەیە کە هۆیەکانی ڕاگەیاندن بەهیچ شێوەیەك لەژێر چنگی ژنانی لادێدا نین بەڵکو خەریکە بەرانبەر بە ژنانی شاریش بیٚ بایەخ دەبن. لێرەدا وەزعی ژنان بەگشتی و بەشێوەیەکی ووردتر شرۆڤە دەکەین و لەهەر شوێنێکی قسەکردنیشماندا ئەگەر هەبوو ئاماژە بە ئامارەکان لەمەڕ کاریگەری هۆیەکانی ڕاگەیاندن لەلادیٚ و شارەکاندا، دەکەین.



بۆ ئەوەی زیاتر کاریگەری هۆیەکانی ڕاگەیاندن لەسەر ژنان و منداڵ و خێزان بەگشتی لەبەنگلادیشدا روون بکەینەوە، پێویستە دووخاڵی گرنگ و زیندوو لە بەر چاو بگرین:

خاڵی یەکەمو گرنگ یان هۆکاری یەکلاکەرەوە لە کاتی هەڵسەنگاندنی کاریگەری هۆیەکانی ڕاگەیاندن بەسەر کۆمەڵی بەنگلادیشدا تێبینی دەکرێت، ئەویش ئەو کەلێنە گەورەیەی دابەشبوونی دانیشتوانە لەناوچە شارنشین و گوندەکاندا , (19 ملیۆن) کەس لە کۆی (98 ملیۆن) کەسدا لەناوچە شارنشینەکاندا نیشتەجێن(6).

خاڵی دووەم – کە پێویستە لەبەرچاو بگیرێت، ئەویش وەزعی ژنانی پێگەیشتووە لە کۆی دانیشتواندا لەو وڵاتەدا لە هەرسیٚ بواری (ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئاستی خوێندن و فێربوون) دا.

تا ئێستاش ژنان لەبەنگلادیش وەکو دایکێك ڕۆڵی سەرەکی لەخێزاندا دەبینن بەبیٚ گوێدانە ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتیان. کە ئەوەش کاریگەری لە دروستبوونی کەسێتی منداڵەکانیدا هەیە، هەر لە چەپاندن و بیروباوەڕی باو و دیدی ژنان لەبەرانبەر ژیان. کە هەموو ئەو هۆکارانە کار لە ڕەوشت و ئادگاری منداڵ دەکات، لەبەر ئەوەی منداڵان ساڵانی دروست بوونی کەسایەتیان لەژێر سەرپەرشتیو ڕێنمایی دایکان بەسەر دەبەن,بەشێوەیەکی ڕێژەیی کاریگەری باوك لەچاو دایك بە کەمتر دادەنرێت تەنیا لەبواری ماددیەکەدا نەبێت، بۆیە هەڵسەنگاندنمان بۆ هۆیەکانی ڕاگەیاندن لەسەر ژنان لەوانەیە ببێتە سەرچاوەیەکی گرنگ لە دانانی کاریگەریی لەسەر منداڵانی بەنگلادیشدا.

دانیشتوانی بەنگلادیش بەشێوەیەکی نزیك لە یەکسان بەسەر ژنان و پیاوان دابەش دەبن(7)، کەواتە(ئەو کۆمەڵگەیە دەبێتە مایەی ئیفلیج بوونی خۆی نەتوانیٚ هەلی ژیان بڕەخسێنیٚ بۆ نیوەی کە 50 ٪ ئەندامەکانی خۆی). بەگوێرەی ئاماری ساڵی 1981 نەخوێندەواری لەنێو خەڵکدا بەربڵاوەو ڕێژەی دانیشتوانی خوێندەوار (لە تەمەنی پێنج ساڵی بەسەرەوە) دەگاتە 8, 28 ٪، واتە ژنان نزیکەی لە 16 ٪ی دانیشتوانی

خوێندەوار پێك دێنن كە بەرانبەرە لەگەڵ 31٪ی پیاوان كە خوێندەوارن(8). لێرەوە پێویستە ئەوە بڵێین مەبەست لە (خوێندەوار لە ناو ژناندا ئەوانە دەگرێتەوە كە تەنها دەتوانن قورئان بخوێننەوە)

ئەم كەلێنە بەشێوەیەكی ئاشكرا تر لەنێوان كچان و كوڕاندا لە زانكۆی دەككا دەردەكەوێ (كە گەورەترین زانكۆی ئەم وڵاتەیەو دەكەوێتە پایتەختەوە). كە ژمارەی كچان نزیكەی (3400 لە كۆی 13332 خوێندكار) دا پێكدێنن واتە نزیكەی 25 ٪ لە كۆی گشتی خولی فێركردنی ساڵی خوێندنی 1984 دا(9).

ڕێژەی خوێندەوارانی ڕەگەزی نێر و ڕەگەزی مێ لەناوچە شارنشینەكاندا بەرز ترە وەك لەناوچە لادێكاندا (10) تەنها نزیكەی 11٪ ژنان پیادەی چالاكیە ئابووریەكان دەكەن، بەو واتایەی كە ژنان بەشداری لەئیشی هەندێك لەكارگەو نوسینگەكان لەناوچە جیاجیاكانی ووڵات و هەندێجاریش لە كێڵگە كشتوكاڵیەكاندا11) دەكەن‌و هەمیشە ژنان ئەو بڕە پارەیەی كە لەو ئیشانەدا دەستیان دەكەوێت، كەمترە لەچاو پیاواندا، بەتایبەتی لەكارگەو كێڵگە كشتوكاڵیەكاندا، بەڵام بەگشتی كرێی كاریان لەنوسینگەكاندا لەگەڵ پیاواندا یەكسانە و ئەگەر چی ڕێژەی ئەو ژنانەی لەو ئیشەدان بەبەراورد لەگەڵ پیاواندا زۆر كەمترن ئەوەش زیاتر یارمەتی دەرە بۆسەلماندنی كزی ئاستی ئابووری وماددی ژنان.

لە ساڵی 1984 بەدواوە حكومەتی بەنگلادیش سیاسەتی دامەزراندنی پیادەكرد كە بەلای كەمەوە لە 15 ٪ لە كرێكارانی ژنان لەمەڵبەندەكانی حكومی و نیمچەحكومی و دەزگا سەربەخۆكاندا دامەزراند. ئەوەش تەنیا بۆ كارە نائیداریەكان، جێ بەجێ كراو لە فەرمانرەوایەتی سەرۆك زیادا ئەو ڕێژەیە كەمبویەوە بۆ لە 10٪.

دەكرێ بڵێین ئەو سیاسەتەی حكومەت بۆ وەزعی دیاریكراوی ژنان لەئیش كردندا هەنگاوێكی گرنگ بوو بۆ بەرەو پێشەوە چوونی وەزعیان، چونكە ژنانی هاندا بۆ زیاتر خۆسەلماندن و سەربەخۆبونیان لە ڕووی ئابوورییەوە. بەو هۆیەوە ئێستا ژنان كەمتر تووشی كێبڕكێ دەبنەوە بۆ



دەسكەوتنی كارێك بۆ خۆیان ئەمەش وایكرد كەمتر هێرش بكرێتە سەر ئەو ژنانەی كار دەكەن لە دەرەوەی ماڵ بەهۆی جێ بەجێكردنی ئەو ڕێژەی 10٪ ی كەحكومەت دیاریكرد،

لە ساڵی 1971 ەوە كە بەنگلادیش سەربەخۆیی بەدەست هێناوە، ژنان ناچار بوون لەژێر گوشارێكی ئابووری زۆر توندا هەلی بەدەست هێنانی كارو سەرمایەی زیاتر بۆ داهاتی خێزان بقۆزنەوە (12)، بۆیە ئەم سیاسەتە واتە (سیستمی دیاریكردنی ڕێژەیی) وەكو پێشتر باسمان كرد، (بەواتای بەشداری ڕێژەیەكی دیاریكراو لە ژنان و دامەزراندنیان لەكاردا – وەرگێڕ)، ئەو سیاسەتی ڕێژەییە كە مەبەستی پاراستنی ژنانە لە كێبڕكێ , بەندە لەسەر فەلسەفەی پوچەڵ كردنەوەی جیاكاری لەسیاسەتی دامەزراندندا.

بێگومان ئەم سیاسەتە لەواقیعدا وەكو پێویست جێ بەجێ نەكرا، چونكە تا ئێستاش لەبەنگلادیشدا دابونەریت و بنەمائایینیەكان زاڵە كە هەرگیز ڕێگە بە ژنان نادات لەچالاكیەبەهێزەكانی دەرەوەی ماڵدالەگەڵ پیاودا بەشداریبكات . ئەمەش بۆتە هۆی سودوەرنەگرتن لەو هەلەی لەلایەن حكومەت بۆیان ڕەخساوە چونكە ژنان نەیاندەتوانی شەڕی توندڕەوی ئەو بەرهەڵستكارە بەهێزانە بكەن.

بێجگە لەو كێشانە, لەپاڵ كێشە كۆمەڵایەتی و ئاینیەكاندا كێشەیەكی ترسناكتر هەیە كە پێویستە لەبەرچاو بگیرێت ئەویش ئەوەیە، لەو دەزگا خزمەتگوزاریانەدا تەنها لە 15 ٪ ی شوێن بۆ كرێكارانی ژن، دانراوە هەر چەندە لەچاو توانستی ژناندا، ڕێژەیەكی زۆرە، بەڵام تێكرایی ڕێژەی نەخوێندەواری لەنێو ژناندا دەبێتە هۆكارێك بۆ قورسی جێ بەجێكردنی ئەم سیاسەتە بەتەواوی، بۆیە لەو هەلە بەدەست هاتووەی كە حكومەت بۆ ژنانی دابین كردووە هەتا ئاستی فێربوون و خوێندەواری بەرز لەنێو ژناندا نەیەتە دی ژنان ئەوەندە سوومەندنابن.

وەزعی لاوازی ئابوری ژنان بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ بایەخی كاری ژنان لەكۆمەڵدا یەك نایەتەوە.

جۆری ئیشی ڕەخساوو ڕێپێدراو بۆ ژنان لەناوچە لادێ نشینەکاندا زۆرە. بۆیە وا دەردەکەوێ کە لەپاڵ ئیشی ڕۆتینی ڕۆژانەی ژنان لەماڵەوە، چاندنی گەنم و دروێنە و کۆکردنەوەی خەرمان و لەم جۆرە ئیشانە لەسەر شانی ئافرەت بێ(13، هەروەك لەخشتەی سالأنەشدا وا دەردەکەوێ کە بەدرێژایی ساڵ زۆربەی زۆری کاتەکانیان سەرقاڵ بن و کارەکانیان زۆرتر دەبێت . لە کاتی کۆکردنەوەی خەرمان ڕێگەیان پێنادرێت پشوو بدەن یاخود کاتێکی خۆش بەسەر بەرن .

زوو شووکردنی کچان دەبێتە هۆی سکپڕبوونی یەك لە دوای یەك و لەدایك بوونی منداڵی زیاتر (تەمەنی ناوەڕاست بۆ مێردکردن لە نێوان 11 بۆ 12 ساڵی دایە). دیارە لەم ماوەیە شدا ژنان بەلای کەمەوە (5تا6) منداڵیان بۆ دەژی، بەخیوٚ کردنی ئەوهەموومنداڵە و ناندان و پەروەردەکردنیان کاتێکی زۆرو توانایەکی زۆر لە ژنان دەبات، لەلایەکی ترەوە لێپرسراویی تەواوی ماڵ وخێزان وخواردن دروست کردن و دوبارە وسێبارە بونەوەی ئەم ئیشانە و لە پاڵ ئەوەشدا کۆکردنەوەی داروکێشانی ئاو لەبیرەکانەوە بۆماڵ و زۆر ئیشی تری لە م جۆرە، هیچ کاتی بۆ کاری تری ژن نەهێشتۆتەوە.

ئەگەر بێتو بارو دۆخی ژنان لە بەنگلادیش لە بەر چاو بگیرێت ,ئەوا مەودای سستی کاریگەری ئامرازەکانی راگەیاندنمان بۆئاشکرا دەبێت لەسەر ژنان . خەریکە کاریگەری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان, لەبەر زۆری ڕێژەی نەخوێندەواران لەنێو ژناندا وون دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئەو ڕۆژنامەو بلأوکراوانەیان بەدەست دەگات، نەزانراوە لەچاو ئەو ژمارە زۆرەی دانیشتوان کەخۆی لە (80) ملیۆن کەس دەدات.

ئەگەر بەراورد بکرێت بۆ نمونە ڕۆژنامەیەکی وەکو ئیتیفاقی (ittefaque) کە پر فرۆشترینیانە و ڕۆژانە نزیکەی (200 هەزار) دانەی لێ دەفرۆشرێ, و دەچێتە لادێکانی دەرەوەی پایتەختیش. بەلأم ژمارەی ئەو لادێیانە تەنیا (68 گوندن) و ناوەندی ژمارەی دانشتوانیش لەهەر



یەکێکیاندا دەگاتە (1450 کەس).بۆیە ژمارەیەکی کەم لەو ڕۆژنامەیە دەگاتە ئەو شوێنانە . ئەگەر ڕێژەکەشی وا دابنێین کە لە 10٪ی دانیشتوانی گوندەکان خوێندەوارن ، کەواتە ڕۆژنامەکان بە هیچ جۆرێك ئامانجی خۆیان ناپێکن. ڕاستە زۆر کات ئەم ڕۆژنامانە بە ئاشکرا لەکتێبخانە وخوێندنگاکاندا دەخوێندرێتەوە, بەلأم هەتا ئەگەر دانشتیوانی گوندەکان گوێبیستی هەواڵ و نوسینەکانی ڕۆژنامەکانیش بن، بە دڵنیاییەوە کەسێکیان سەری لێ دەرناکەن چونکە زۆربەی بیرکردنەوەو بۆچونەکان لە دەرەوەی زانیاری و ئەزموونی ئەواندایە، سەبارەت بە ژنانی لادێکانیش تەنها لە 2٪ ی خوێندەوارن، هەر وەکو تێبینیمان کرد هیچ کاتێك نادۆزنەوە بۆخوێندنەوەی ڕۆژنامە، هەتا ئەگەر لەبەردەستیشیان دابێ، وەك باویشە ڕێگە نادرێت بە ژنان بچنە ئەو شوێنانەی کە بە ئاشکرا ڕۆژنامەی تیادا دەخوێندرێتەوە، ئەو کاتانەش کەهەواڵێکی ڕۆژنامەکان لەلایەن منداڵأنیان یاخود پیاوانی خانەوادەکەیان پێبگات ، مێشکیان توانای شیکردنەوەو قسە لەسەر کردنی نیە.

ڕۆژنامەکان لەشارەکاندا خزمەتیان زیاترەو کاریگەریان لەسەر هەردوو چینی دەسەلأتدارو مام ناوەند داناوە، نەخوێندەواران لەشارەکاندا پەیوەندیەکی توندو تۆڵیان بەخوێنەرانەوە هەیە لە ڕێگەی ئەوانەوە هەواڵ وزانیاریەکان وەردەگرن و تێی دەگەن. لەمیانەی بەریەك کەوتنی کۆمەلأیەتیاندا، ژنانی شارنشینیش بەدەگمەن ڕۆژنامە دەخوێننەوە، چونکە بەشێوەیەکی گشتی بەچالاکیە کۆمەلأیەتییەکان و ئیشی ماڵەوەیان سەرقاڵن.ژمارەیەکی کەم لە مێینە لە زانکۆ و نووسینگەکاندا رۆژنامە دەخوێننەوە .ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ژنان بایەخ بەمەسەلە نیشتمانی و جیهانیەکان نادەن، ئەم دیاردە نێگەتیڤە لە ئەنجامی کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵگەی بەنگلادیش لەلایەن پیاوانەوە یە .کە ئەوەش دواکەوتویی بەسەر ژنان سەپاندووە و وایکردووە ژنان ئەو مەسەلانە بە دوور لە چوار چێوەی گرنگی پێدانی خۆیان بزانن .

ئەوان زیاتر ڕوو لە خوێندنەوەی گۆڤارەکانی جوانکاری وتایبەت بە پۆشاك دەکەن نەك ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی سیمایەکی ئەکادیمی و هزرییان هەیە ، گۆڤارە میللیەکانیش خشتێك لەسەر فراوانی ئاسۆی بیری ژنان دانانێن، چونکە بۆچونەکان مەیلیان زیاتر پەیوەستە بەبۆچوونە باوەکان، هەروەك چۆن ئەم گۆڤارانە زیاتر کچان وا لێدەکات باوەڕ بە جوانی و کابانی خۆیان بکەن و بایەخیان تەنیا بۆ ئەو بوارانە بێ زیاتر نەك وەکو مرۆڤێك بڕوای بەتواناای خۆی هەبێ، هەروەها ئەم گۆڤارانە وێنەیەکی رۆمانسیانەی مێینەیی لەچاوی ئەو کچانەدا دەنەخشێنن و پەیامی ئەو رۆمانسیەتەش ئەوەیە کە سەرنج ڕاکێشانی سێکسی باشترین زامنە بۆ شوکردنێکی باش کە هەموو خواستێکی کچ دەبێ ئەوەبێ.

لەبەنگلادیش دوو گۆڤاری هەفتانە بەناوی (بوربانی و شترالی) تایبەت بەفیلم و جل و بەرگ و ئارایشت کردن دەردەچێت کە ئەمانەش کچانی گەنج زیاتر هاندەدات بۆ بایەخدانیان بە جل و بەرگ و ڕووکەش و دەرەوەی خۆیان وەکو ناسكو نازدارێك بۆ بەرچاوی پیاوان . گۆڤارێکی تری ژنان بەناوی (بیجوم) هەیە کە (50 هەزار) دانەی لێ دابەش دەکرێ وتەنانەت دەگاتە لادێ دوورە دەستەکانیش،بەگشتی ئەم گۆڤارانە بیری بۆرژوازی وشێوازی ژیانی چینە دەوڵەمەندەکان نیشانی ژنانی لادێ دەدەن، ئەوەش پەیوەندی نیە بە ژیانی ڕۆژانەیانەوە تەنیا هەلاتنێکی کاتی نەبێ لەوەزعی ناهەمواری خۆیان.

ئێزگە لە نێوان هۆیەکانی تری ڕاگەیاندن جیاواز ترە لە بەنگلادیش چونکە توانای گەیشتن و کاریگەری زیاتری لەسەر زۆرینەی خەڵك هەیە , ئێزگە کەناڵێکی جیهانییە واتە دەتوانێ نێوان وماوەی زۆر ببڕێت و زاڵ ببێ بەسەر نەخوێندەواری.

هەروەك دەکرێ لادێ دوورە دەستەکانیش سودی لێ ببینن ئەو لادێیانەی کە تێکڕای ڕێژەی نەخوێندەواریان بەرزەو پرۆگرامی تەندروستی و کشتوکاڵی و فێر بوون و پرۆگرامی دیاریکردنی زۆر بوونی



منداڵیان نییە، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین هێشتا ئێسگە بە هۆکارێکی گەیاندنی بە جەماوەر لە چاو تەلەفزیۆن دانانرێ. ئەگەرئەوەشمان لەبەر چاو گرت حکومەت توانا و کۆنترۆڵی لەسەر ئێزگە هەیە ئەوە دەبینین کە ئەگەر پلانی پێویستی بۆ ڕێك بخات دەکرێ ڕۆڵی گرنگ ببینێت. بەلاَم کۆسپی زۆریش هەن لەبەردەم جێبەجێکردنی، بۆیە دوایی نابێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەو هەژاریە کوشندەیە، بەتایبەتی لەگەڵ نەبوونی پرۆگرامێکی (خۆش گوزەرانی) بۆ ژنان لەلادێکاندا کە ئەوانە کاریگەریەکانی ئێزگەن لەسەر ناوچە لادێ نشینەکاندا.

لە لێکۆلینەوەیەکی نوێدا کە ئێزگەی بەنگلادیش ئەنجامی داوە، دەرکەوتووە، ژنانی لادێ بەگشتی گۆشەگیری ناوماڵن، هەروەك لەلێکۆلینەوەکەدا هاتووە کە ژنان بەهیچ شێوەیەك بەشداری لەوەرگرتنی بڕیارناکەن هەتا ئەگەر بڕیارەکە پەیوەندی بەکاروباری خێزانیشەوە هەبێ، لەگەڵ ئەوەی ژنان کێشەی دەست نەکەوتنی پارەیان هەیە بۆ کڕینی پێداویستیەکانی ناوماڵ، هەتا هەرزانترین ئامێریش، هەموو ئەو هۆکارانە توانای گەیشتن بە ئامێرە فێرکاریەکان کەم دەکەنەوە. سەرباری ئەوەش ڕێگە نادرێ بە ژنان بچنە بازاڕو لەوێ دانیشتن و قسەکردنیان بۆ نییە ، هەروەك ناتوانن لەو شوێنانە گوێ لە رادیۆ بگرن و هەتا خاوەنی رادیۆی بچوکیش نین کە بەپیل دەگەڕێ. لە ئەنجامدا ژنان دەربارەی هەموو مەسەلە گرنگەکان هەر لە دواکەوتوییدا دەمێننەوە.

لەگەڵ ئەوەیدا لە 97,1 ٪ لە ژنان لەم لێکۆڵینەوەیە دانیان بەوەدا ناوە کە ئێزگە باشترین هۆکاری گەیاندنە لەلادێکانی بەنگلادیشدا، هەر لە هەمان لێکۆلینەوەشدا ڕای هەموو بیسەران وەرگیراوە کە دەبێ بەرپرسانی ئێزگە پێداویستی و هەڵوێست و گرنگی ڕای لادێ نشینەکان لەبەرچاو بگرن، بۆ ئەوەی بتوانرێت بەباشترین شێوە لەگەڵیاندا لەکاروانی پێشکەوتن بەردەوام بن. بەلاَم هەتا ئەگەر بەرپرسانی ئێزگەکان بەباشترین نیەت بەرنامەی تۆکمەیان بۆ داڕشت، هێشتا کۆسپی تر دێتە پێشەوە بۆ گەیاندنی ئەم بەرنامانە بە لادێکان. چونکە دەبێ

بەرنامەکان بەشێوە زاری خۆماڵی پێشکەش بکرێن ئەوەش مەحاڵە ئەنجام بدرێ چونکە (لە هەموو بەنگلادیشدا تەنها 7 کەناڵ هەیە بەتەلەفزیۆن و ڕادیۆشەوە) چوون گوندیەکان بەگرانی دەتوانن لە زمانی نوسینی بەنگالی تێبگەن. هەر لەهەمان لێکۆڵینەوەدا هاتووە کە لە ساڵی 1977 دا لە کۆی دانیشتوانی بەنگلادیشدا کە دەگەیشتە 80 ملیۆن کەس، تەنها دوو ملیۆن ئامێری رادیۆ لەسەرتاسەری وولآت بەکاردەهێنرێن، هەروەها دەبینین کە خەڵکێکی زۆر لەگووندەکاندا کۆدەبنەوە بۆ گوێگرتن لە رادیۆ، هەندێجار ئەو خەڵکە ژمارەیان دەگاتە 100 کەس کە بەدیار یەك رادیۆوە دانیشتون، بۆیە رادیۆ وەکو هۆکارێکی گەیاندن ناتوانێ سوودمەندبێت، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە هەر جوتیارێك ئامێرێکی ڕادیۆی خۆی هەبێت، ئەوە تا ئێستا وەکو خەونێکی دوورە بۆ وڵاتێکی وەکو بەنگلادیش کە داهاتی ساڵانەی بۆ هەر یەکێك تەنیا (90 دۆلارە) لەبەرامبەردا نرخی هەر رادیۆیەکی یەك شەپۆلی لەنێوان (350 بۆ 550 تکا) دەبێ بەرانبەر(2 بۆ 20 دۆلار) هەتا خەڵکەکە ڕایان وایە کە نرخی پیلیش زۆرە لەچاو ئەو داهاتە کەمەی ئەوان هەیانە.

دەوڵەت خاوەنی وێستگەیەکی پەخشی تەلەفزیۆنییە، تەلەفزیۆنیش وەکو کەناڵێکی گەیاندن بەجەماوەر لەلادێکانی بەنگلادیش سودێکی ئەوتۆی نیە، نرخی ئامێر زۆر گرانە و بەمەش ناکەوێتە دەستی هەموو خەڵکێکی ئاسایی. بەگشتی لە 10 ٪ ی خێزانەکان خاوەنی تەلەفزیۆن نین هەتا لەشارەکانیشدا، لەساڵی 1984 زانراوە کە ژمارەی ئامێری تەلەفزیۆن لەبەنگلادیشدا (38. 245) ئامێر بووە لەو ساڵەدا (بێگومان ئێستا گۆرانکاری بەسەر ئەو ڕێژەیە دا هاتووە –وەرگێر).

لەگەڵ ئەوەشدا کە تەلەفزیۆن بەباشترین ئامرازی گەیەنەر دادەنرێ بۆ جەماوەر بەهۆی کاریگەری لەسەر هەردوو هەستی بینین و بیستین بەڵام ئەو هەژاریە کوشندەیە نەیهێشتووە لە تەلەفزیۆن سوود وەرگرن. لەگەڵ ئەوەشدا گومانیش لەوە دەکەین کە توانای سوودمەندبوونیان لە



تەلەفزیۆن لەزۆربەی بەرنامە پیشاندراوەکاندا هەبێ، چونکە ئەم بەرنامانە پلانێکی وایان بۆ دانەرێژراوە کەوێنەی ژیانێکی خاڵی لەهەموو فشارێکی فیکری یا ئابووری یا کۆمەڵایەتی پیشان بدەن بە درێژایی مێژوو حکومەتە یەك لە دوا یەکەکانی ئەو وڵاتە درکیان بەوە کردووە کە تەلەفزیۆن ئەگەر بەربلاوبێت ئەوا توانای گەیاندنی پەیامی ئەوانی هەیە بۆ گەل.

لەساڵی 1980 لەکاتی دەسەڵاتی زیا دا بەرنامەی دابەشکردنی ئامێری تەلەفزیۆن لەهەموو سەنتەرە گشتیەکانی کە خەڵك لەشوێنی نیشتەجێ بوونیان لێی کۆدەبنەوە, دەستی پێکرد و تا ئێستاش بەردەوامە، بەڵام هیچ کاریگەریەکی پۆزەتیڤی بۆ ژنان نەبووە، چونکە ناهێڵن ئەوان بچنە ئەو شوێن و سەنتەرانەوە، تەنیا بە دەگمەن نەبێ, چونکە ئەوە بەپێی داب ونەریتە کۆمەڵایەتیە چەقبەستووەکان, تابۆن، چارەسەریش لێرەدا سەرلەنوێ بنیادنانەوەی ریشەیی سیستمی کۆمەڵایەتیە.

سینەما جۆرێکە لەهونەرە پیشکەوتووەکان کەسوودی سیاسی گەورەی هەیە، لینین زوو درکی بەوە کردووە، هەر بۆیە لەساڵی 1919 ئەیزنشناین رادەسپێرێ کە لەو کەناڵەوە ئامانج و هۆکارەکانی شۆرشی سۆڤیەت بۆ جوتیارانی سۆڤیەتی شیبکاتەوە. ئەویش بەشێوازێکی سادە مێژووی شاراوەی رووداوەکانی ساڵانی 1905–1917 لە (شۆڕشی سیاسی) باسکردووە.

تا ئێستا (کۆتایی هەشتاکان) لەبەنگلادیش فیلمێکی لەو شێوەیە کە باس لەبزاڤی سەربەخۆیی وولآت بکات بەرهەم نەهاتووە، لەگەڵ ئەوەی کە بابەتێکی روونەو هەڵگری پەیامێکی نەتەوەیی بەهێزە. لەبەنگلادیش، لەچوارچێوەی پیشەسازی سینەمادا، ڕێژەیەکی کەم مەسەلە نەتەوایەتی و نیشتیمانیەکانی گرتۆتەوە، لەئەنجامدا فیلمی وا بەرهەم دەهێنرێت کە نەك هەر پەیامێکی دیاریکراوی نیە، بەڵکو لەگاڵتەجاڕی بەولاوە شتێکی ترنیە هیچ خەیاڵێکی تێدا نییەو (روداوەکان) پیشانی بینەران نادات.

لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا ئامارێکی وورد لەمەڕ دەرخستنی ڕێژەی جەماوەر لە سینەما لەنێو دانیشتوانی بەنگلادیشدا نیە. بەڵام لەڕێگەی دەرخستنی تێکرای گرتنی کورسیەکان لەکاتی نمایشکردنی فیلمێکدا دەتوانین مەزەندەی ڕێژەی کەسانێ بکەین کە دەچن بۆ سینەما. ئەویش 5 ٪ ی کۆی دانیشتوانی بەنگلادیش پێك دەهێنێ، ئەوەش بەکەمترین ڕێژەی تەماشاکەرانی سینەما دادەنرێت لەجیهاندا و ژمارەی ئامادەبوانی ژنیش لەو ڕێژەیەدا پنتێکی گچکەیە.

ئەگەر وا دابنێین سینەما کاریگەریەکی گەورە لەسەر ڕەوشت و ئاکاری جەماوەر دادەنێ، ئەو ڕێژەکەمەی ئامادەبوان کە دەبینرێ بوار نادات سینەما ببێتە ئەو هۆیەی کە کاریگەری خۆی ببینێت. سینەماو نیشاندانی فیلم لە لادێکانی بەنگلادیشدا بە هیچ شێوەیەك ڕۆڵیان نیە، ئەو ڕۆڵە کەمەشی کە هەیانە لەچوار چێوەی دانیشتوانی شاردا دەخولێتەوە. تا ئێستا دەتوانین زۆرێك لە دانیشتوانی لادێ دوورە دەستەکان دەست نیشان بکەین کە هیچ شتێك دەربارەی ووشەی سینەما نازانن و لای ئەوان هیچ واتایەکی نیە، کەسانێکی کەم هەن داهاتێکی ئەوتۆیان لە بازاڕی ڕۆژانەی خۆیاندا دەست ناکەوێت بەڵام جارجارەکاتی خۆیان لەسینەما بەسەر دەبەن لە شارە بچوکەکان، ئەگەر بابەتەکانی فیلمەکە لە سینەمادا بابەتی بەسودیش بێ، ئەوا ژمارەی ئەو گوندنشینانەی کە تێی دەگەن و سودمەند دەبن زۆر کەمن ,جگە لەوەش نرخی بلیتی یەك کەس بۆ سینەما لە نێوان (9 تا 15) تکادایە بەرانبەر (35, 0 – 50, 0) دۆلارە ئەم نرخەش، بڕە پارەیەکی زۆرە بۆ زۆربەی خەڵکی بەنگلادیش، لەبەر ئەوە تا ئێستاش نەتوانراوە بە ئیمکانیەتێکی زۆرەوە سینەما وەکو کەناڵێکی گەیاندنی بەهێز بەجەماوەر بناسێنرێت.

هە ر بەپێی ئەو توێژینەوەیە زۆربەی فیلمەکانی پیشان دەدرێن باس لە پاڵەوانیەتی و چیرۆکی خۆشەویستی دەکەن وەکو نمونەی کۆنی پیرۆز کە لەچوارچێوەی بیری باو و لاساییدا خۆی دەبینێتەوە، یاخود زیاتر بابەتگەلێك و باسێك پیرۆز ڕادەگرێ کە ژن وەك قوربانیدەر بۆ





خێزان و ڕێبازە ئاینیەکە و پاکیزەییەکەی نیشان دەدات، ئەمەش بۆ خۆی سروشتیکی سۆزداری خەمناکی هەیە، کە دوا جاریش ژنانێك بەرهەم دێنێ، هیچ دەسەلأت و توانایەکیان بۆ قەدەرو چارەنوسی خۆیان نابێ و هیچ پەنایەکیشیان لەو دونیایەدا دەست ناکەوێ، بۆیە لێرەوە دەبینین کە سینەما ئیفلیجە لە پرۆسەی ئازادکردنی ژنان لە بەنگلادیشدا.

فیلمە تۆمارکراوەکان ڕەواجێکی پەروەردەیی کەمیان هەیە بۆ کەسانی دانیشتووی لادێکان. لەگەڵ کەمی (هۆیەکانی گواستنەوەی کەل و پەلی روناکی)، لەوەدا دەبینین مەحاڵە جۆری ژیانی لادێ گۆڕانی بەسەردابێت بەهەبونی سینەما، هەتا ئەگەر فیلمی کۆنیش لەو شوێنانەدا دەست بکەوێ.

بۆ سوودمەندبوون لەم کەناڵی گەیاندنە، حکومەتی بەنگلادیشی ڕایگەیاند کە لەتوانایدایە نمایشی ئەو جۆرە فیلمە تۆمارکراوانە بکات کە بیری پێشکەوتووخوازیان تێدایە، بۆ نموونە ڕێکخستنی خێزان و شێوازی نوێی کشتوکاڵی بەلأم بەنەبوونی هۆیەك(سینەمای گەڕۆك) بۆ گەیاندنی خەڵك و نمایش کردنی فیلم ئەوا هیچ سودێك ناگەیەنێت. بەگشتی مەحاڵە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، کاریگەریان هەبێ بۆ دروست بوونی ئامانجە هاوبەشەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی خەڵك، چونکە نەخوێندەواری و هەژاری هەموو وولأتە دواکەوتوەکانی تەنیوەو تەنانەت هیچ کاریگەریەك لەلایەن ڕاگەیاندنەکانەوە بۆ زۆربەی خەڵك لە بەنگلادیش بەجێ نەماوە بەتایبەتیش لەسەر ژنان و مندالأن، چونکە خەڵك لەتوانایدانیە سوودمەند بێ لە ڕاگەیاندن بەهۆی نەخوێندەواری و نەبوونی پارە و داهاتێکی کەمی تاك و دەوڵەت وەکو دیاریشە کە ژنان بەدڵنیاییەوە تووشی ئەم ئاستەنگیانە دەبن بەهۆی ئەو فشارە کۆمەلأیەتیەی لەسەریانە کە ئاسۆی ژیانی ژنانیان لەخێزاندا کز کردۆتەوە، لەئەنجامدا ژن وای لێ دێت هیچ گرنگیەك نەدا بەمەعریفەو رۆشەنبیری جیهانی خۆی و دەرەوە.

کۆمەڵی بەنگلادیش بە شێوەیەکی دیاریکراو دابەش دەبێتە سەر دوو جیهان : جیهانی ژن و جیهانی پیاو، لەمیانەی بنەمای مۆڕاڵی کە پشت بە ڕەگەز دەبەستێت، ئەم دابەشبونە لەگەڵ ئەو گۆشەگیریەی کەبەسەر ژناندا سەپێنراوە لەخۆیدا هانیان دەدات کە هیچ گرنگیەك بەدونیای دەرەوەیان نەدەن و بگرە عەقڵیان کڵۆم بدەن لە بەرانبەر هەر بیرکردنەوەیەکی تازەدا، ئەمەش وادەکات ژنان نەتوانن بە هیچ جۆرێك سود لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندن وەرگرن، هەتا ئەگەر هەموو شێوەکانیشی لەبەر دەستدا بێت، لەم دۆخەدا پێشبینی ناکرێت ژنان ڕۆڵێکی هەمە لایەنەبگێرن هەتا ژنانی شاریش (ئەگەرچی هەندێ جیاوازیش لەنێوانیاندا هەیە) چونکە لەو ڕۆڵەیاندا سەرکەوتوو نابن و ئەگەر ڕووبەرووی کۆمەڵ و جیهانی دەرەوەش بن بەئاسانی ناتوانن بچنە ناو ئەو دەزگا چالاکانەی کۆمەڵ، کە دووره لە شوێنی نیشتەجێی ئەوان، کە ئەمەش هەڵوێستی ئەوپیاوانەی بەشداری ژنان لەچالاکیە کۆمەڵایەتیەکاندا ڕەتدەکەنەوە و ڕێگری لە بەردەم ژناندا دروست دەکەن هەتا ژنانی شارنشینیش پتەوتر دەکات. وەکچۆن دەبینین لەزۆربەی کۆمەڵگاکاندا ژن و پیاو لە هەردوو ڕەگەزدا بەئازادی و یەکسانی لەنێو کایە گشتیەکاندا تێکەڵ بەیەکتر دەبن.

دواجار دەتوانین بڵێین کۆمەڵێکی داخراوی وەکو بەنگلادیش هیچ هەلێك نابەخشیتە ژنان کەسود مەندبن لەوبابەتانەی کە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن پێشکەشی دەکات بۆیە پێویستە ژنان فێری خوێندەواری بن و لە هەمان کاتیشدا لەباری ئابوریەوە سەربەخۆبن بۆئەوەی هەنگاوی بەرایی بۆ ئەمە بهاوێن. هەرچەندە ئەگەر ژنان ئەو هەنگاوانەش ببڕن هێشتالە بەرانبەر کۆمەڵێکی چەپێنراو و پاشکەوتووی بەنگلادیشدا لەوەزعێکی ناکۆك خۆی دەبینێ وڕێگاشی بۆ گەیشتن بە ئازادی بە دەیان کۆسپی جۆراوجۆر تەنراوە.





## *تێبینیو سەرچاوەکان*

1-شێخ موجیب پێگەو ئیمتیازەکانی سوپاو بیرۆکراتیەکانی سوپای بەرتەسك کردبوەوە ئەوەش یەکێ لە هۆکارەکانی کەوتنی بوو، موجیب بە پێچەوانەی حاکمەکانی دوای خۆی لەو وڵاتە چوار بنەمای بۆ حکومەت راگەیاند:

ناسیۆنالیزم , دیموکراسی,سۆسیالیستیو عەلمانیەت (دواتر ئەو بنەمایانە لەدەستوریشدا جێگیرکرا ) بەشێکی فراوانی میللەت هەردوو بنەمای (سۆسیالیستیو عەلمانیەت ) یان وەك دوو بنەمای فەرمی حکومەت هەرگیز قبوڵنەدەکرد.

دواتر لەلایەن زیا ء عەبدولرەحمان و حەسەن موحەممەد ئیرشاد, ئەم هەلەیان قۆزتەوە, ئەم دوو سەرۆکە بەهێزە وە پشتگیریان لە هەستی نەتەوەییو نیشتیمانی گەلی بەنگلادیش کردو سۆسیالیستیو عەلمانیەت و دیموکراسییان روکەشیانە رەت کردەوە بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە موجیب بە ئامانجی بەرژەوەندی گشتی حوکمی کردبێ, بەڵکوئەندامانی حزبەکەی لەماوەی حکومرانی ئەودا ئیمتیازاتی بێ سنوور و زۆیان هەبوو و تاوانی گەورەو زوڵمی کۆمەڵایەتی زۆرو خراپترینیان ئەنجام دەدا.

2-ئەوەی شایانی باس بێ ئەوەیە کە نەبوونی کەرەسە کۆسپ دەخاتە بەردەم هەر پرۆگرامێکی تایبەت بەگەشەسەندن , پشتبەستنی بەنگلادیش بە کەرەسەکانی بیانی وای لیێ کردوە نەتوانێ پرۆگرامی گەشەسەندن یەردەوام وجێبەجێ بێت, هەروەها لە دەسەڵات و حوکمی سەربازیدامەیل بۆ رازیکردنی سوپایە ,بۆیە پشکی گەورە لە بودجەی حکومەت بۆ بەشی سەربازیو بەرگری دەروات.

بەواتەیـەکی تـر 40٪ لـە کـۆی بودجـە بـۆ جێبـەجێکردنی وەزارەتـی بەرگریە .(کتێبی گیرفان 1984, 1985, لاپەرە 409.

3.بروانە ت, بلانکێت ( T.Blanchet)( ژنوپیسی وژینگەوپەراوێز بوون)، ماناو کەسێتی منداڵ بوون لە لادێکانی بەنگلادیشدا (دەککا – 1984).

4–لێرەدا هەندێ لە خێڵەکانی بەنگلادیش پشت بە کۆمەڵی دایکسالاری کـۆن دەبەسـتن بـەڵام ئـەوان ژمارەیـەکی ئـەوتۆنین وکاریگەریشـیان کەمەوجێکەی باس نین.

5–کۆمـەڵی توێژینـەوەی ژنـان بـۆ ژنـان، بـە کۆمـەڵێك لێکۆڵینـەوە کـە بەتوندی جەخت لەسەر ئەو تێبینی یانە دەکاتەوە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك بڵاویـان دەکاتـەوە لێرەش کتێبێـك هەیەکـە شـایەنی بـاس کردنـە ئەویش کتێبی (دۆزی ژن، دەککا،1979).

6–کتێبی گیرفان بەنگلادیش بۆ ئامار 1984–1985 لاپەرە 104.

7–هـەمان سەرچـاوەو کتێـب سـاڵی 1984 ،(5،50 ملیـۆن ) نێـر و (9، 47)مێ.

8–لەهەمان کتێب لا 4.

9–ڕاپۆرتی سالانەی 82 –1984 (دەککا، 1985) هاوپێچی 4 لا 6.

10–ئـەم ناکۆکیـە لـە بنەرەتـدا بـۆ عـادات و نـۆرمی دووره پـەرێزی ژنـان دەگەرێتەوە لە سیستەمی ئیسلامیدا.

داب و نـەریتی کچـان ناچـار دەکـات تـەنیا بـەبونی پیـاویکی گونجاولـە ژیانیـدا ، شـوو بکـات ، هاوسـەرگیری زوو دورە پـەرێزبووە بەرادەیـەکی زۆرتـر لەناوچـە لادیـەکان وەك ناوچـە شارسـتانیەکان ،ئـەوەش ئـەوە دەگەیـەنێ کەرێـژەی خوێنـدەواران لەشارەکاندا زیـاترە لـە کتێبـی (دۆزی ژن) (دەکـکا ، 1982 بەشـی یەکـەم) عائیشـی نوعمـان شـیکردنەوەیەکی کردوە بۆ (رادەی کاریگەری دوورەپەرێزی و داب و نەریت و لەسەر ژنان).

1 –کتێبـی گیرفـان لـە بـەنگلادیش لـە ئامـاردا(1984 –1085) لا 120

ژمارەی کارگە تۆمارکراوەکان لە ساڵی (82– 1984) ، 792 3 کارگە ،



هێزی کاری ژنان لەو کاتەدا بەم شێوەیە (3, ملیۆن لە ساڵی 1974 ، 1,5 ملیۆن (لەساڵی 1981 ) 2،4 ملیۆن لە ساڵی 1084 لەهەمان کتێب لا 162

12–کتێبی گیرفان بەنگلادیش بۆ ئامار (1984 –1985) لا 526 –528.

13– بـۆ مشـتومڕی ئـەم بابەتـە بەدرێـژی کـراوە لـە کتێبـی (دۆزینـەوەی نیوەکەی تر) ) دەککا1979.

14–ڕاپۆرتێك لەسەر (سەفیە ئەحمەد) لێکۆڵەر لە ئێزگەی بەنگلادیش لە میانەی رادیۆی بەنگلادیش بەخش کراوە (دەککا 1979 ).

15–کتێبی گیرفان بەنگلادیش لە (ئامارێکدا) 1984 – 1985 لا 341.

16–لەهەمان کتێب لا 341.

17–ئەنجومـەنی لۆکـاڵی لـە نوێنـەرانی کۆمـەڵێك لادێ پێکـدێ بـۆ بیروراگۆڕینـەوە لـە میانـەی چـالاکیە کۆمەلایەتیـەکان و نـاوی بـە (ناوەندەکانی نیشتەجێ بوون ) دەبرێ.

18–(Alamgi kabir) (فلیمـی بـەنگلادیش ) دەککـا‘1979، بروانـە (کتێبی گیرفان ئاماری بەنگلادیش – 84– 1985) لا 498.

19 –ئەمانەی خوارەوە جەخت دەکاتەوە .

أ– یەکێ لەمامۆستاکان لە زانکۆ دەککا لە ژوری مامۆستایان نەزانینی خۆی لەورووداوە ناخۆشەی (شیرنوبل) دەربڕی.

ب–دانـەری کتێبەکـە – بینـی کـە بـەم دوایانـە لـەکاتی ڕۆیشتن بۆ یانەی مامۆستایان و فەرمانبەران لە زانکۆ لە کاتی کارێکی بچوکدا ، کەهاورێـە پیاوەکان بەچاوێکی سووك لێی دەروانن .

# بەشی دووەم

## بنەما مۆراڵەکانی ژن لەئیسلامدا

( شیکردنەوەی تیژی یەکسانی )

## پێشەکی

1- بنـەماوبیری یەکسـانی لـەنێوان مرۆڤەکانـدا بـۆ خـۆی باسـێکی ئەبستراکت نیـە بـۆ یەکسانییوون، بـەڵکو سیسـتمێکە چـۆن پێویسـتە؟و دەتوانرێت بە هۆیەوە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا بکرێ.(1)

2- (جیاکاری دژی ژنان) گوزارشتە بۆجیاوازی یان پەراوێز یاخود کۆت و بەندکردن کە لەسەر بنەمای ڕەگەز بەندە وئامانجیشـی لاواز کردن یا نەهێشتنی مافە مرۆییەکانی ژن و نەبوونی ئازادیـەکی ڕاستەقینەیە بۆ ژن لەسەر بنەمای یەکسانی نێوان ژن و پیاو لە هەموو بوارەکانی رامیاری و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کەلتوری ومەدەنی، یان لە هەر بوارێکی تردابێ جگە لەوەی کە ژن هاوسەرە لە خێزاندا.(2)

ئـەوەی لـە سـەرەوەدا باسـمان کرد، وەك ڕێبـەرێك بۆئـەو لێکۆڵینـەوەو شـیکردنەوەیەی کـە لەسـەر پرەنسـیپە ئەخلاقیـەکانی تایبەتـە بـە ژنـان لـە ئیسـلامدا پێشـکەش دەکـەین. ئیسـلام بنەمایـەکی بـۆ ژنـان دانـاوە کـە لەشـــەریعەت و فەرمودەکانـــەوە سەرچـــاوەی گرتـــووە، پەرەســـەندنی پرەنسیپەکانی ڕەوشت بەرزی لە بنەڕەتدا پشت بە ڕاڤەی ئایـەتی قورئان و فـەرمودەکانی پێغەمبـەر دەبەسـتێت. لێـرەدا دوو ئاراسـتەی جیـاواز بـۆ ئەم راڤە کردنانـە هەیـە، ئـەوانیش :مەزهـەبی سوننە و مەزهـەبی شیعەن، لەگەڵ قۆناغە جیاوازەکانی هەردوو مەزهەبەکە.(3)



لێرەشـدا ئێمـە پێمـان باشـە لـە توێژینەوەکەمانـدا تەنیاخاڵـە هاوبەشـەکانی شـیکردنەوە ی هـەردوو مەزهەبەکە لەبـەر چاو بگـرین و لە خاڵە ناکۆك وجیاوازەکاندا خۆمان بەدوور بگرین،

مەبەسـت لەلابردنی،بۆچـونە جیاوازەکـان لەشـیکردنەوەی هـەردوو مەزهەبەکـەدا, خۆلادانـە لەهـەر کێشـە و گرفتێك کـە پێویسـت بەباسـکردن ناکات وپەیوەندی بە باسەکەی ئێمەشەوە نیە،بەڵکو گرنگ لێرەدا ئەوەیـە کە نایەکسانیلە ئیسلام و لەلای موسوڵماناندا پشت بە جیاکاری ڕەگەزی دەبەستێت کە پێشووتر باسمان کرد.

((بارودۆخی ژن لە شەرعدا ))

ئیسلام دان بـە یەکسـانی ژن و پیاودادەنێت لـە هـەردوو بـواری مـادی ورۆحیـدا , واتـە یەکسـانیەکی تـەواو، دەگـوترێ. (ئـیش و کـردەوەی بـاش بەرهـەمی باشـی لێ دەکەوێتـەوە بـۆ نێرومـێ بەیەکـەوە) (قورئـان- سـورەتی 3، ئایـەتی 194) (4) هـەروەها (بەهەشـت و بەرەکـەتی بـۆ هەردووکیانـە) (قورئـان – سـورەتی 4 ئایـەتی 124) هـەردووکیان لـە ژیـانێکی باشـترو خۆشـتر دەگـوزەرێن, قورئـان دان بـەمافی چـون یـەکی ژن و پیـاودا دەنـێ تەنانەت لەبوارە مادیەکەشدا ژن دەتوانێ داهات و موڵك بۆ خۆی بەدەست بهێنـێ ومـافی میراتگـری هەیـە هـەروەها کـارکردنی لـە هەرئیشـێکدا وەکو پیاوە.(5) .

ئـەم ئایەتانـەی قورئـان کەلـە سـەرەوە باسـمان کـرد لـەبواری تیۆریـەوە جـەخت لەسـەر یەکسـانی تـەواوی نێـوان ژن وپیـاو لەئیسـلامدا دەکاتـەوە، بـەڵام هێشـتا ئایـەتی زۆری ترهـەن کـە بەئاشـکرا بـاس لـە پلـە دوویـی ژن دەکەن لە بەرانبەر پیاواندا. لەگەڵ بـونی ئەوانە ومافەکانیان هێشـتا پیـاو باڵادەست ترە لە ژن (6).

لێرە دەست دەکەین بەشرۆڤە کردنی ئەولایەنانەی خوارەوە کە لەبنەما ئەخلاقیـــەکانی قورئـــانو فەرمودەکانـــدا هـــەنو لەچوارچـــێوەی بـــیری یەکسانیەکەشدا شییان دەکەینەوە (7):

1- ئامانج لەبونی ژن.

2- پەروەردەی ژن.
3- گۆشەگیری ژن.
4- ڕۆڵی دیاریکراوی ژنان لەژیانی پراکتیکیدا.
5- باری یاسایی ژنان.

**1- ئامانج لە بوونی ژنان:**

ئاشکرایە ژن بۆئەوە دروست کراوە کە حەسانەوە ببەخشێتە پیاو(ق.7), وەك ئەوەی تەنیا یەك ئامانجی هەبێ, ئەویش ڕازی کردنی پیاو, ئەمەش لەناواخندا ئەوە دەگەیەنێ کەژیانی هیچ نرخ وبەهایەکی تری نیە تەنیا ئامرازێکە بۆ تێرکردنی پیاو کە لە جیهانی ئێمەدا نوێنەرایەتی خوا دەکات، ئەم لۆژیکەش دژی یەکسانیە، چونکە یەکسانی لەخۆیدا واتاهەموو کەسێك بەهای خودی خۆی هەیە و واتای تایبەت بەژیانی ئەو هەیە , ناکرێ وەکو ئامرازێك بەکاربهێندرێت (بەلای کەمەوە لەلایەنی ئەخلاقییەوە).

ئامانجی دووەم لەدروستکردنی ژنان کە سەرنج ڕاکێشترە لەدیدی یەکسانیدا, ئەویش منداڵبونە، لەپێناو بەردەوام بوونی مرۆڤایەتیدا، لێرەشدا پیاو دەسەڵاتی تەواوی کۆنترۆڵکردنی ژنانی پێدرا(ق.2).

پیاو بەئارەزووی خۆی کەی ویستی ژن وەکو کێگلەیەك بۆپیتاندن بەکاردێنێ، ژنیش پێویستە پێشوازی لەوە بکات لەپێناو لەزەتی ئەودا. پیاو وەکوسەرچاوەیەکی لەزەت ژن بەکاردێنی, قورئان هۆشداری داوە لەبارەی خراپ بە کارهێنانی دەسەڵاتی پیاو بەرانبەر بەژنان. ئەمەش بەهەلەیەکی پیاو دادەنێ، بەهەرحاڵ ئافرەت تەنیا ئامانجێك نیە بۆ خۆی، بەڵکو ئامرازێکە بۆ خۆشنودی وڕازیکردنی پیاو لەمیانی سێکس کردن و وەچەخستنەوەدا.

**2- پەروەردەکردنی ژن(8):**





هیچ میتۆدێك بۆ پەروەردە و ڕاهێنانی ئافرەتان نییە، بەڵام بەمەزەندە ئەوە دەبینین کە ئاکارە باشەکانی ژن لە لای موسوڵمانان تەنیا گوێرایەڵی و رەوشت بەرزییە ، چونکە ئامانج لە هاندانی وفێربوونی ژنان بریتیە لەچەسپاندنی بیرۆ کەی فەرمایشتکردنی پیاو کە مێردەکەیەتی، کە ئەو دەبێتە کە نیزەکی (9). لەسەرئەوەشەوە مادام ژن بۆ ئەوە دروست بوە کە پیاو بەختیار بکات، شتێکی لۆژیکیە کە ئامانج لە پەروەردەکردن و ڕاهێنان و فێربوونی تەنیا بەختەوەریدان بێت بە پیاو، ئینجا ئەم خۆشبەختیە چ لە رووی جەستەیی یان زەینی یان رۆحیەوە بێت.

پیاوی خوێندەوار پێویستی بە ژنێکی خوێندەوارە بۆ ئەوەی لەرووی ڕوحیەوە لەگەڵی بگونجی، لێرەدا ژن جگە لەئەرکی خۆی، ئەرکێکی تری بۆ زیاد دەبێ واتە بێجگە لەفەرمایشتی پیاوو ئیشی ماڵ وبەخێوکردنی منداڵ دەبێ خوێندەواریەکی هەبێت، بۆ ئەوەی بۆ پیاوێکی خوێندەوار دەست بدات. ئەوەش تەنیا ڕوپەرێکە بۆ یەکسانی بوون کە ئامانج لێی بەخشینی دووجار بەقەدەرئەو لەززەت و ئارامیەی بەڕەگەزی باڵادەستە کە پیاوە(10).

**3- گۆشەگیری ژن :**

قورئان ڕێگە لە ژن ناگرێ لەکاتی پێویست بچێتە دەرەوە، بەڵام دەبێ جلێك بپۆشێت کە تەواوی جوانیەکانی ژن، داپۆشێ. واتە لەئیسلامدا گۆشەگیریەکی تەواو بۆ ژن لەناو ماڵی خۆیدانیە، بەڵکو دەکرێ بچێتە دەرەوە ,بەڵام پێویستە نەزەرنەکەن و چاویان داگرن و هیچ شوێنێکیان بەدەرنەخەن و خۆشیان نەرازێننەوە، هەروەها لەسەریانە سنگیان داپۆشن لە دەرەوەی ماڵەکانیاندا، لەسەریانە پێداویستیان کەم بێ لە دەرەوەی ماڵدا وکاتی تەواووفۆکسیان بۆئەرکەکانی ناوماڵ بێت. و ڕێگەیان پێ نادرێت هیچ جۆرە تێکەڵاویەك بکەن تەنیا لە سنووری ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانیدا نەبێ. مەملەکەتی ژن لە ئیسلامدا لەناو ماڵەکەیەتی، کە لەوێدا هەردوو ئەرکی خۆی وەکو ژن و دایك بەجێ دەگەیەنێ (بوخاری 67 : 9).

ئەگەر ژن هەمان توانای پیاوی لەفەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتدا هەبێ، بۆچی ڕێنادرێت بە ژن ببێتە سەرۆکی وڵات ؟

یاخود نەتوانێ دەسەڵاتی خێزانەکەی وەکو پیاوەکەی بەدەست بێت ؟ دەگوترێ ژن دەسەڵاتی لەسەر ماڵی و مێردی و منداڵیدا هەیە، بەڵام چۆن دەتوانێ لەکاتێکدا کۆمەڵگە و یاسا ڕێگە بەفرە ژنی دەدات و ژنەکانی تریش هەمان مافیان هەیە لەگەڵیدا، ئەمەش بۆ ژن ڕوون وپراکتیکی نیە، دەڵێن ژن دەسەلاّت بەدەستە لە ماڵی خۆیدا ئەوەش تەنیا بۆدڵدانەوەی ودەسەلاّت پێدانی گەر بە شێوەیەکی ڕوو کەشیش بێت .

لەکەلتوری ئیسلامدا نوسراوی زۆر هەن کەجەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەوگۆشەگیریەی ژنان بە مەبەست نیە و بۆ ئەمەش نموونەی ژنانی پێغەمبەر دەهێننەوە لەژیانی گشتیدا، کە پێغەمبەر کاتی خۆی هەمیشە یەکێك لەژنەکانی هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی هاورێی بێت لەسەفەرە درێژەکانیدا، بەلاّم ئەم نموونەیە تەنیا ناتوانێ ئەوە بسەلمێنی کە گۆشەگیری واقعی نیە یان جیاکاری رەگەزی بێ مەبەستە پرسیارەکەش لێرەدا ئەوەیە :

ئەی چی دەڵێن سەبارەت بە ژنانیتری پێغەمبەر ئەوانەی کە دەمانەوەو هاوڕێیەتیان نەدەکرد؟ ئایا ئەوانیش بۆ پێداویستی مەعنەوی و شتی تر بیری پێغەمبەریان نەکردووە؟. بێگومان وەلاّمەکە ئەرێیە, ئەوان هیچ شتێکی تریان بۆ نەماوەتەوە تەنیا چاوەڕوانی کردنی ئەونەبێ، ئەویش بەپاراستنی داوێنیان بە پاکی و ڕاستگۆییان بۆ پێغەمبەر تا کاتی گەڕانەوەی.

ئەم نموونەیە پێویستی پیاودەسەلمێنێ بۆژن لەو جۆرە گەشتانەدا بۆ ئەوەی مێشکی و لەشی حەساوە بێ، دەتوانێ لەگەڵ خۆیدا بیبات. لێرەشدا ئەوەندە بەسە بۆ دەرخستنی ئەو بانگهێشت کردنەی قورئان بۆ گۆشەگیرکردنی ژنان لەزۆربەی کاتدا کە جیاکاری ڕەگەزی و نایەکسانیەکی تەواو لەنێوان ژن و پیاودا دروست دەکات.

4- ڕۆڵی دیاریکراوی ژنان لەژیانی پراکتیکدا:



لەدوای مەسەلەی گۆشەگیری، بانگهێشتی قورئان دێت سەبارەت بەدیاریکردنی ڕۆڵی ژن خۆی لەژیانی ڕۆژانەدا، دەبینین جیاوازیەکی زۆر لەنێوان ژن و پیاو دادەنێت کە تایبەت بێ بەتوانا سروشتیەکانیان کارو لەنێوانیاندا بەگوێرەی ئەم جیاوازیە دابەش دەکرێت. پیاو لەرووی جەستەییەوە ا بەهێزترە و بۆیە ئەو هێزە زۆرەی ئەو بۆ کاری گرانیش دەشێ. لەکاتێکدا ژنان لە رووی جەستەییەوە لاوازن و تەنها بۆ کاروباری ناوماڵ و بەخێوکردنی منداڵ دەشێن(11). کەواتە ڕۆڵی ژن و پیاو لێرەدا دیارە هەر یەکێکیان بۆ ئەو کارەیە کە لەگەڵ سروشتیدا دەگونجێ، واتە ژن لە سیفەتی خۆشەویستی و سۆزدا سەرکەوتووە و لەئیسلامیشدا داوای پەروەردەکردن و بەخێوکردنی منالّی بەسۆزو خۆشەویستیەوە لێکراوە، و پیاو لێپرسراوی ژنە و لە دواجاریشدا بەتەواوی کۆنترۆڵیان دەکەن

ڕێنماییەکانی قورئان زوومی تەواوی خستۆتە سەرجیاکاریە بایەلۆژیەکانی نێوان ژن و پیاو ، هەموو ئەرك و وەزیفەکانیش بەگوێرەی سیفەتە سروشتیەکانیان دابەش دەکات، بەلاّم دیارە تەکنەلۆژیا و پێشکەوتنی ئەمرۆی هاوچەرخ پێویستی بەهێزو بازووی مرۆڤ نیە، هەروەك قورسە باوەڕبەوە بکەین کە ژنان لەڕووی توانای هزری و ڕۆشەنبیریەوە لاوازن و ناتوانن پشت بەئابووری تایبەتی خۆیان ببەستن (هەروەك ناتوانن یارمەتی خیزانیشیان بدەن), ئەمرۆ ژنان ناچارنین پشت بەپیاو ببەستن بۆ ئابوری خۆیان و لەسەر حیسابی ئازادی خۆیان لەژێر کۆنترۆڵی پیاو دابن. لەژێر ڕۆشنایی یەکسانیدا ئەرك و مافەکانی ژن و پیاو وەك یەکن تەنیا ئەوە بەسە کە بۆ پێداویستیە بایەلۆژی و سۆزداری خۆیان یەکتر تەواو بکەن.

ژن پێویستی بەوەیە لەڕووی کەلتوری و هونەری و بوارەکانی تردا پەرە بەخۆی بدات ، هەروەها زۆربەی زانا و دەرونناس و کۆمەڵناسەکان (بۆچونەکانیان پشت دەبەستێت بە ئەزمونە پراکتیکیەکان) و باوەڕیان وایە کە گونجانی کۆمەلاّیەتی لەبنەڕەتدا بەرپرسە لەوبۆچونەی کە

سیفەتی نموونەیی دەداتە پاڵ هەریەك لە ژن و پیاو. لێرەدا ئاسان نیە بیروباوەڕێك پەسەند بكەین كە لەپشتیەوە باس لە بێ توانایی مێشكی ژن دەكات و دەبێتە هۆكارێك بۆ سەربەخۆنەبوونی ژن لەڕووی ئابووریەوە. هەروەك بەڵگە نامەكانی مافی مرۆڤ دان بە ئەركی كەم ئەندامان و ناژیرەكان لە ڕووی ئەقڵەوە دادەنێن، كە لەدواجاردا دەبێ كۆمەڵگا قەبوڵی هەموو بارە نائاساییە بایەلۆژی و سروشتیانەی ژن بكات وەك (سوڕی مانگانەی ژنان، منداڵبون، ماوەی شیردان وبەخێوكردن) بۆیە پێویستە كۆمەڵگە پابەندبێ و ئیلتزامی پێوە بكات(14).

ئەگەر ئازادی هەڵبژاردن بدرێتە دەست ژنان خۆیان، ئەوا ئەركی ڕۆژانەی خۆیان وبایەلۆژی واتە منداڵ كەوتنەوە و بەخێوكردن و.. هتد. بەجێدەگەیەنن وەكو تاكێكیش، یاوەكو كەسێكی پێشكەوتوو كامڵ لە كاری دەرەوەشدا خۆیان دەسەلمێنن (مەبەست لەوتاكەی بەبێ جیاكاری ڕەگەزی وەكو مرۆڤ چاوی لێدەكرێت) ئەمە خاڵێكی گرنگە لە لۆژیكی یەكسانیدا(15).

لێرەدا سروشتی ژن لەیەك ئاستدا نیە، ئەگەر بەراوورد بكرێت لەگەڵ جیاوازیەكانی نێوان ژن و پیاودا، بە واتایەكی تر سروشتی ژنان تەنیا لەسەر مێیینەبوونیان نەوەستاوە, بەڵكە سروشتی ژنان زۆر لەوە دەوڵەمەندترە لەبەر ئەوەی زۆر خاڵی هاوبەش لەنێوان ئاكارو سروشتی نێوان ژن و پیاودا هەن، بۆیە پێویستە ئەو خاڵە هاوبەشانە لەوەسفی سروشتی ژناندا زیاد بكرێت، ڕۆڵی ژن لەلایەك وەكو هاوسەرو لەلایەكی دیكەش وەكو ژنی ماڵەوە، بەشێك لە سروشتی ژن دەنوێنێ، لەسەر حیسابی كەسێتی گشتی ژنان ، ئەمەش شتێكی نالۆژیكیە و خزمەت بەڕەگەز پەرستی پیاو دەكات ودژی لۆژیكی یەكسانیە.

5- **باری یاسایی ژنان :**

قورئان توانای ژنان بۆ گەواهیدان لە دادگا وپرۆسەی هاوسەربووناكەمدەكاتەوە, ئەگەر گەواهیدەر پیاو بوو تەنیا یەك كەس بەسە، بەڵام ئەگەر ژن بوو ئەوا دەبێ دوان بن لەترسی ئەوەی نەوەك



یەكێكیان شتێك لەبیر بكات , ئەوەی تر دەبێ بیری بێنێتەوە، ئەو جیاكاریە لە توانای ژنان كەم دەكاتەوە، چونكە لۆژیكی ژیان دەڵێ (مرۆڤ هەڵەدەكات.) ئەی پیاویش مرۆڤ نیە ؟ ئەی باشە پیاو هەڵە ناكات ؟ یان دیارە تەنیا ژن هەڵەو شت لەبیر دەكات .

لەلایەكی دیكەوە جیاكاریەكی زۆر ڕوون و ئاشكرا هەیە لە یاساكانی نێو دەوڵەتی و وەرگرتنی ڕەگەزنامە لەكاتی پرۆسەی هاوسەربوندا، بۆ نموونە ئەگەر ژنێكی موسوڵمان شوی بە بێگانەیەك كرد لە وڵاتێكی ئیسلامیدا ئەوا مێردەكەی نابێتە خاوەن رەگەزنامەی ئەو وڵاتە ، بگرە ژنەكە رەگەز نامەكەی خۆشی لەدەست دەدات ، بەڵام ئەگەر پیاوێكی موسوڵمان ژنێكی بێگانەی هێنا لە وڵاتێكی موسوڵماندا ئەوا ژنەكەی ڕەگەزنامەی وولاتی مێردەكەی وەردەگرێت.

## مافەكانی ژن لە هاوسەر بوون و جیابونەوەدا :

موسوڵمان لەسەریەتی هاوسەرێتی ئەنجام بدات، ئیسلام هانی زگورتیەتی نادات و ئەو كاتەش ڕێگە بەجیابونەوە دەدات وەكو دوا چارەیەك (نەخواستراوترین حەلاڵ لای خوا جیابوونەوەیە)لە قورئاندا ڕێنمایی دیاریكراو بۆ مافی ژنان لە هاوسەرێتی و جیابونەوەدا هەیە كە تیایدا بە ئاشكرا جیاكاری لەسەر بنەمای ڕەگەز, بەدیاردەكەوێ. هەروەها لایەنگریەك بۆ جیاوازیەكی سروشتی نێوان هەردوو ڕەگەزەكە هەیە.

جیاكاریەكانیش لەوخاڵانەی خوارەوەدایە :

1- فرە ژنی
2- سەرپەرشتیكەر لەهاوسەرێتیدا
3- زەماوەند كردن لەگەڵ ناموسوڵماناندا.
4- ڕەزامەندی ژن لە زەماوەند كردندا.
5- هاوسەرێتی لەگەڵ كەنیزەدا.
6- مافەكانی جیابونەوە.
7- زینا كردن.

**1ـ فره ژنی :**

شەریعەتی ئیسلام لەیەك كاتدا قەبوڵی لە ژنێك زیاتر بۆ پیاو دەكات واتە فرەژنی بۆ پیاو، بەڵام بۆ ژن تەنیا یەك هاوسەر ڕێگەی پێدراوە، پیاو لەشەرعدا ڕێگەی پێ دەدرێت چوار ژن بهێنێ، گرنگ ئەوەیە مارەیی بۆ بدرێت ئەگەر چی ئەم هەموو ژنە سەرپێچی كردنە لەبنەماكاندا، بەڵام باتڵیش نیە، لەبەرانبەریشدا ئەگەر ژنێكی جیابوبوەوە لە مێردەكەی پەلەی كرد لە شوكردنەوەیداو چاوەڕوانی تێپەربوونی ماوەی دیاریكراوی (عدە) ی نەكرد ئەوا سزا دەدرێت(16).

**2ـ سەرپەرشتیكەر لە هاوسەرێتیدا :**

پیاوێك ئەگەر گەیشتبێتە تەمەنی پێگەیشتوو، داوای لێ ناكرێ لێپرسراوی هەبێ بۆ ڕازی بونی لە ژن هێناندا و پێویستی بە لێپرسراونیە، بەڵام ژن ناتوانێ شووبكات هەرچەند تەمەنیشی هەبێ یاخود شارەزایی لە ژیاندا هەبێ، تەنیا ئەو كاتە نەبێ كە لێپرسراوێكی پیاوی هەبێ و بەشوكردنەكەشی ڕازی بێ(17). هەروەها لە هیچ هەلومەرجێكدا ژن ناتوانێ بۆ هیچ ژنێكی تر ببێتە سەرپەرشتیكار، چونكە ئەمەبە هاوسەرێتیەكی ناتەواو دادەنرێ، بەبێ ڕەزامەندی سەرپەرشتیارێكی پیاو، هەروەها بەزیناكردنیش دادەنرێت(18).

**3ـ زەماوەندی تێكەڵاو لەگەڵ ناموسوڵمانانداا :**

پیاوێكی موسوڵمان دەتوانێت ژنێك سەر بە هەر ئاینێكی تر بێت بكاتە هاوسەری خۆی، تەنیا بت پەرست و ئاگر پەرست نەبێت(19)، بەڵام ژنێكی موسوڵمان ناتوانێت شوو بە غەیرە موسوڵمانێك بكات(20)، بەڵكو پێویستە پێش ئەوەی ئەو پیاوە، ژنە موسوڵمانێك بهێنێ،بوبێ بەئیسلام، ڕێگریە كۆمەڵایەتی و داب و نەریتەكان هەرچیەك بوون لە سەردەمی پێغەمبەر، كاریگەریان هەبووە لەسەر ئەم شەرعیەت دانە، چونكە بوەتە ئاكامی جیاكاری لەسەر بنەمای رەگەزلە ئیسلامدا.



**4ـ ڕەزامەندی ژن لەزەماوەند كردندا :**

هەموو ڕێنماییەكان لە فەرموودە و ئایەتەكاندا هانی خەڵك دەدەن كە ڕازی بوونی ژن لە زەماوەندكردندا پشت گوێ بخەن، وا دیارە ئەمەش لەوەدا هاتووە كە كاتێك لە پێغەمبەر دەپرسن چۆن دەتوانین ڕەزامەندی ژنان بەدەست بێنین، ئەویش لە وەڵامدا ووتویەتی (تەنیا بێ دەنگیەكەی بەسە)(21).

**5ـ هاوسەرێتی لەگەڵ كەنیزەدا :**

سەرەڕای ئەوەی كە شەرع ڕێگەی بە پیاو داوە تا چوار ژن بهێنێت, لە هەمان كاتیشدا دەتوانێ هەر چەندی بیەوێت (كەنیزە و دیل بكات بەژنی خۆی و دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ئەو كەنیزەو هەموو ئەو ژنانەدا هەیە كە لەشەڕدا بەدیل دەگیرێن(22)، هیچ سنورێك نیە بۆسێكس كردنی پیاو لەگەڵ چەندین لەو ژنانەی كە ئەوخاوەنیەتی ،ئەمەش بە موڵكێكی بەدەست هاتوو(مكتسب) دادەنرێت (23)

لە هەمان كاتدا ڕێگە بە كەنیزەی شووكردو بەكۆیلەیەك نادرێ كاری سێكسی لەگەڵ گەورەكەی ئەنجام بدات، یەكلایەنە لەو حاڵەتەدا سەپێنراوە، هەروەك خاوەن كۆیلە مافی ئەوەی نیە لەگەڵ كەنیزەیەكی شوكردوو رابوێرێت(24)، ئەمەش ئاگاداركردنەوەیەكە بۆ كەنیزەی ژن و ڕێگە گرتنە لە فرە مێردی.

ئەگەر ژنێكی ئازاد شووی بەكۆیلەیەك كرد بەبێ رەزامەندی خاوەن كۆیلەكە، ناتوانێت داوای مارەیی بكات و كاتێكیش دەتوانێ شوو بە كۆیلەكە بكات كە سەرپەرشتیكارەكەی رازی ببێت(25).

**6ـ مافەكانی جیابونەوە :**

لێرەدا جیاكاریەكی تەواو هەیە لە مافەكانی جیابونەوەدا ، لەسەر بنەمای ڕەگەز، پیاو دەتوانێ بەبێ مەرج و هیچ هۆكارێك ژنەكەی تەڵاق بدات، تەنها ئەوەندە بەسە كە دڵێ پێی خۆش نەبێ, دەتوانێ تەڵاقی بدات، وپیاو دەتوانێ دەسەڵاتی جیابونەوە بدا بەژنەكەی هەرچەندە ئەمە بەدەگمەن ڕوودەدا، بەڵام سەرباری ئەوەی ئەمە مافێكی ژنەكەیە دەبێ

هەڵەیەکی مێردە کەشی لەپاڵێدا دەستنیشان بکات،دەبێت مەلاش قایل بکات بەو هۆکاری جیابوونەوەیە دەنا دانی پێدانانرێت.

سەر پەرشتیکردنی منداڵ لە پاش جیابوونەوە لەسەر بنەمایەکی نایەکسان دیاریکراوە ,پیاو بە تەواوی مافی سەر پەرشتیکردنی منداڵەکانی دەگرێتە ئەستۆ و بەڵام ژن گەر دووبارە شو بکاتەوە یان هەر بەبێوەژنی مابێتەوە مافی سەرپەرشتیکردنی مناڵەکانی نیە. هەمووماڤێك لە بۆ پیاوە، سەرپەرشتیکردنی منداڵ لە پاش پیاویش بەر باوکی وخوشك و براکانی دەکەوێ ئەگەر پیاوەکە مردبێ یاخود ئەقڵی لەدەست دابێ.

لێرەدا بەروونی جیاکاریەکی تەواو لەنێوان ڕەگەزەکاندا بەدی دەکرێت، لەم کۆمەڵگا باوکسالاریەی کە دان بەمافی ژن وەکو مرۆڤ نانێت(26)، سەرباری ئەوەش ژن دەبێ 3 مانگ دوای مردنی مێردەکەی چاوەڕوان بکات، ئینجا شوبکاتەوە و لەم ماوەیەشدا دەبێ لەماڵی مێردەکەی بێت(27)، لەکاتێکدا پیاوی موسوڵمان دەتوانێ دوای دەربرینی وشەی (تەڵاقم دایت) ژن بهێنێتەوە، کە لەچوار چێوەی حەڵاڵ کردنی چوار ژن دا، ئەم ژن هێنانەش بەشەرعی دادەنرێت.

**7ـ زیناکردن :**

زینا ڕوویەکی تری جیاکاری ڕەگەزیە, لە قورئاندا دەقێك بۆ سزادانی ژن و پیاو هەیە بەیەکەوە. بەڵام دەبێ بڵێین کەبەهانەو پێداویستی پیاو بۆ زینا کردن زۆر کەمترە لەچاو ژنان، چونکە ژنان زیاتر لەبارە تایبەتیەکان توشی ئەو حاڵەتە دەبن و هەروەك دەبینین ژنانی تر بەشداری ژیانی هاوسەرێتی لەگەل مێردەکەیدا دەکەن، (وەك ژنی تر کەبەسەری هاتوون، کەنیزە، ژنانی دیلی شەڕەکان لە هەندێ جاردا) بۆیەش لەوحاڵەتانەدا بەناچاری لەبەرنەبوونی پێداویستیە سێکسیەکان توشی دەبێ ، سەرباری ئەوەش وەك لەفەرمودەکاندا هاتووە پێویستە دەبێ ژن پاکیزەیی خۆی بپارێزێت و نابێ دوای نەمانی مێردەکەی بەساڵێك شوبکاتەوە هەتا ئەگەر مێردەکەی بێ سەروشوێنیش بێت(29).



بەڵام پیاو چوار ژنی لەیەك کاتدا دەبێ و جگە لەو کەنیزانەی کە بۆ ڕابواردنی خۆی دەتوانێ لەژێر دەسەڵاتیدا بێت. بێگومان بەم وەزعەش پیاو هەرگیز پێویستی بە زیناکردن نابێت ( لێرەدا دیارە کەدوو پێوانەی جیاواز بەکاردێت). بەڵام ئەمە لە حاڵەتی هەتیوبازی لەنێوپیاواندا جیایە، لێرەشدا ژن ڕەنگە تووشی بەپانپانۆکێ کردن بێت چونکە پیاوەکە زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ ژنەکانی تری یان کەنیزەکانی بەسەردەبات(30).

پیاودەتوانێ بەبەردەوامی ژن بێزار بکات وسەرکۆنەی بکات ئەگەر بچوکترین گومانی لە پاکیزەیی ژنە کەهەبوو، ئەشتوانی دوای ئەوە تەڵاقی بدات یائەگەر نەیویست وەکو ژنێکی خۆی لای بمێنیتەوە(31). بەڵام ژن ناتوانێ ڕێگری لەزیناکردنی مێردەکەی بکات، ئەمە تەنیا بە سەلماندنێك دەبێ کە بۆ ژن زەحمەتە بکرێت. ئەمەش نایەکسانیەکی ڕوونە، چونکە ژن لێرەدا وەکو ئامێرێك لەدەستی پیاودایە و نموونەی کەرەسەیەکی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات و ئەوکەرەسەیەش تەنیا بۆ خۆشی خۆی و منداڵەکانیەتی.

## ژن و میرات

یاساکانی ئیسلام چاکسازی ڕیشەییان خستۆتە نێو ئەو بەشەی کە تایبەتە بە میراتەوە، ئەگەرچی نایەکسانی زۆر لە بوارەکانی تری ئەو یاسایانەدا هەن, لەقورئان داهاتووە کەژنیش بەشدارە لەمیرات لەگەڵ پیاودا, پێشتر لە جیهانی ڕۆژئاوادا باوبوە کە کوڕی نۆبەرە هەموو میراتەکەی باوکی بردووە بەبێ بەشداری کردنی هیچ یەکێك لەمنداڵەکانی تر, لەگەڵ ئەوەشدا کچە نۆبەرە هیچی بەرنەئەکەوت تەنیا لەحاڵەتێکدا ئەگەر باوکی هیچ کوڕێکی نەبووبێ دوای مردنی، هەتا پێش ئیسلامیش کچ بۆی نەبووە میراتگری باوکی بێ, بگرە خۆی بەسامان وموڵکێك دادەنرا جا هی باوکی یاخود براکانی لەپێش شوکردنی لەدوای

شوكردنيشی دەبوە موڵكی ئەو خێزانەی كەتێكەڵیان دەبوو(32), وەزعی ژن لەیاساكانی یەهودیشدا باشتر نەبوو، بەڵكو بە هەمان شێوەبوو(33).

ئەمەش بەكورتی بنەماكانی میراتن لە یاسای ئیسلامدا:

1- ژن ومێرد میراتگری یەكتردەبن.

2- ئەهلیەتی مێینە وخزمەكان لەمیراتدا (هەتا ئەگەر مێینەش بون).

3- كچ هەمیشە نیوەی بەشی كوڕی لەمیراتدا بەردەكەویٚ.

ئەم چاكسازیەی كەكراوە پێویستی بەچاكتر كردنە, چونكە ڕێگە، خۆش دەكات بۆجۆرێك لەیەكسانی نێوان ژن وپیاودا، بەلاّم ڕێژەی (دووان بەرانبەر یەك كەس) بە واتای كوڕ لەشایەتیدا بەدووكەس لەچاو ژن دەژمێردرێت و بەدوو ژن یەك كەس بەرانبەر پیاوێك, نایەكسانیەكی تەواو لێرەدا هەیە، لەقورئاندا میراتی ئافرەت ڕوون و ئاشكرا نابەرابەری تێدایە، بۆ نموونە ئەگەر كەسێك یاپیاوێك بمرێت و تەنیا چەند كوڕێكی دوای خۆی جیٚهێشت بەبیٚ خزم وخەڵكی نزیك، ئەوا میراتە كەبەیەكسانی لەنێوانیاندا دابەش دەبیٚ، بەلاّم ئەگەر هاتوو كچ وكوڕی دوای خۆی جیٚهێشت ئەوا كوڕەكان دوو بەرانبەری پشكی كچەكانیان بەر دەكەوێت و ئەگەر هاتوو دووكچ یازیاتری دوای خۆی جیٚهێشت و كوڕی نەبیٚ ئەوا سیٚیەكی میرات بەیەكسانی بەسەریان دابەش دەكریٚ.

هەروەها لەجیٚ هێشتنی میراتی پیاو بۆ ژن یا بەپێچەوانەوە دوو پێوانەهەیەكە نایەكسانی تێدایە، ئەگەر ژنێك بمریٚ لەدوای خۆیدا چەند كوڕێكی جیٚهێشتبوو ئەوا هاوسەرەكەی چارەگی ماڵ و سامانەكەی بەردەكەویٚ و سیٚ چارەگەكەی تر بەسەر كوڕەكانی دابەش دەكرێت، ئەگەر كچیشی هەبوو ئەوا بەڕێژەی كوڕ دوو بەرانبەری كچ دابەش دەكرێت لە كاتی نەبوونی هیچ مناڵێكدا، مێرد نیوەی میراتی ژنەكەی بەردەكەویٚ بەلاّم ئەگەر هاتوو مێردەكە مردوو لەدوای خۆی مناڵی جیٚ هێشتبوو ئەوا ژنەكەی هەشت یەكی میراتەكەی بەردەكەوێت (34)و ئەگەر هیچ مناڵیان لە نێواندا نەبوو، ئەوا چواریەكی بەردەكەویٚ(35) لەوەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە یاساكانی لە ئیسلامدا هەن تایبەت بە میرات



یەكسانیەكی كەمیش لە نێوان ژن و پیاودا ناهێنێتەكایەوە بەهۆی ئەوەی لە هەموو حاڵەتەكاندا پیاو دوو بەرابەری ژن پشكی میراتی بەردەكەوێت.

## كۆتایی

لە قورئاندا هاتووە كە پیاوو ژن لەبەهەشتدا بەیەكتر شاد دەبنەوە و ژنانیش وەكو پیاوەكانیان دەچنە بەهەشت (ق40:40) هەروەها ژنان كە مێردەكانیان پیاو چاكن دەیانبەنە بەهەشت، هەروەك ئەو پیاوانەی كە دەچنە بەهەشت هاوكات لەگەڵ ژنەكانیاندا ئافرەتی پاكیزەیی هاوتەمەنی خۆیان دەبینن. هەروەها ئافرەتی حۆری جوان و چاو ڕەش و بریقەدار بۆ خۆشكردنی ژیانی پیاوانی موسوڵمانان لەوێدان. ئەو پاداشتانە هەمووی بۆ پیاوی موسوڵمانە، هەرچی پاداشتی ژنە موسوڵمانەكانە تەنیا هاوڕێیەتی كردنی پیاوەكانیانە لەگەڵ بوونی ئەو هەموو ژن و حۆریە جوانانە لە بەهەشت لەدەوری پیاوەكانیان دا. بێجگە لە ئەركی منداڵ خستنەوە رۆڵی ژنان هەروەك لەسەرەتاشەوە هەروایە، تەنیا بۆ خۆشی پیاوە دیارە ئەمەش پشكی ژنە لە دونیا و قیامەتیشدا.

لە كۆتایی ئەم توێژینەوەدا دەمانەویٚ ڕاستیەك بەدەرخەین كە ئێستا لەدونیای هاوچەرخدا دژایەتیەكی توند لە ئارادایە لە دژی ئەو بنەماو یاسایانەی كە پشت بەبیڕی نایەكسانی دەبەستن، هەنوكە دونیا شەڕ لەپێناو یەكسانی نێوان مرۆڤەكان دەكات، لەگەڵ بوونی ئەو رەوتە دواكەوتوو بەر هەڵستكارانەشدا، ئەمەش بەربەرەكانیەكەو ئامانج لەم بەربەرەكانیەش جولاّنەوە بۆ پێشەوە و بەرەو دونیایەكی پێشكەوتووەكە مرۆڤەكان تیایدا خەونی بن بڕكردنی جیاكاری نێوان ژن و پیاو، رەش و سپی، تایەفە و مەزهەب دەبینن.

وەك لەم باسەدا دیارە بنەما مۆرالەكان لە ئیسلامدا جەخت لە نایەكسانیەك لەسەر بنەمای ڕەگەز دەكەنەوە، پێویستە نموونەی ئاكارو

ڕەوشت لەسەر ئاستی جیهان یەك بخرێت كە (هەموو فەلسەفە هاوچەرخەكان لەسەر ئەم خاڵە كۆكن) و پێویستە وا دابنرێ كە هەموو مرۆڤەكان یەكسانن لە دانانی هەر بنەمایەكی ئەخلاقی، بێگومان مرۆڤەكان لەتوانایاندا یەكسان نابن بەڵام ئەمەش ڕێگرنیە لەدانی هەلێك بۆ پێشكەوتن و گەشەپێدان وەكو تاكێك بۆ ئەوەی كەسایەتیان كامڵ و تەواوبێ، ئەمەش ئەو شتەیە كە ژنی موسوڵمان لێی بێبەشە بەهۆی دووفاقی پێوەری ڕەوشتگەری كە بەشێوەو فۆرمی جیاواز لەسەر هەریەك لە ژن و پیاو جێبەجێ دەبێت، ئامانجی ئەم باس و لێكۆڵینەوەیە دەرخستنی نایەكسانیە لە ئایینی ئیسلامدا و بەراورد بوونی لەگەڵ ئەو ڕێرەوە هاوچەرخیە كە داوای مامەڵەی ژن وەكو مرۆڤ و پیاو دەكات لە هەموو بوارەكانداو بەرگریش لەیەكسانیەكی تەواو دەكات.

## تێبینیو سەرچاوەكان





1- بروانە ( Singer.p)ئازادكردنی ئاژەڵان 1975. لا5. سەنجەر.پ

2- بۆ كۆمەڵەی نەتەوە یەكگرتوەكان , بەڵگەنامەی ڕەت كردنەوەی هەموو جۆرە جیاكاریەك دژی ژنان ساڵی( 1979) لا4 ,بگەڕێوە.

3- ئەم لایەنە لەكورتەیەك لە یاساكانی موحەممەدییە (84) چاپی چوارەم,لاپەرە 32–43 باسكراوە.

4- لەوە بەدواوە بۆ (ق3 :194 ) كورت دەكرێتەوە .

5- بڕوانە بۆ (م) (دیانەتی ئیسلام ) 1973 لاپەڕە 529 .

6- بافیجا.هـ.ر (BavjaH.R) (ژن لە ئیسلامدا ) هیدر ئاباد ,هندستان لاپەرە 66 (پەراوێز) .

7- بڕوانە بۆ (ئا,ی عەلی Ali-A.e-) مانا لە قورئانی پیرۆزدا , 19: 3 پەراوێزەكان لا 542 ,

8- بڕوانە (بوخاری , كتێبی زانستی )

9- بڕوانە (قورئان 4: 34).

10- بڕوانە بافیجا لەكاری ناوبراو لاپەڕە 6.

11-بڕوانە بافیجا لەكاری ناوبراو لاپەڕە 73.

12- بەراوردی (فیجا لەكاری ناوبراودالە لاپەڕە 66 بگە) , عەلی .م (دیانەتی ئیسلام ) لاپەڕە 530 لە( پەراوێزدا).

13- عەلی .م (شەریعەتی ئیسلام لەهاوسەرگیریو جیابونەوەدا) لاپەرە 22 (پەراوێزەكان)

بیجوم –ح (H.Bejnm) بگەڕێوە بۆ(ق, 4: 34).

14- ژن لە كتێبی سەوزی قەزافییدا , گۆڤاری كۆمەڵەی ئاسیایی , دەكا, ژمارەی دیسێمبەرلە 1983 لاپەرە 143 (پەراوێز) .

15- تێبینی ئەوە بكرێ زوربەی ڕاڤەكانی ئایەتە قورئانیەكانی جەخت لەوجیاكاریە سروشتیانە دەكەنەوە.

*بەراوردی ئەلبوخاری , حەدیسی 67 :91.

*علی م , لەکتێبی ناوبراۆ لەلاپەڕە 532 .
*باڤیجا لە کتێبی ناوبراو لە لاپەرە 66 (پەراوێز).
16- بڕوانە (ق4: 3) ئەو تەفسیرەی ڕێگە بە پیاو دەدات لەیەك كاتدا چوار ژنی هەبێ .
*بەراوردی (مەلا و بنەماكانی شەریعەتی ئیسلام , بەبی (1968) بەشەكانی 255-256 .
یاساكانی ئینگلیزی -ئە لمحەمەدیە , لەندەن ,لە ساڵی-Wilson)
*بەراوردی (وڵسن (1930) بەشەكانی 31, 32, 33 .

17- بچۆرەوە بە (علی م) نامیلكەی فەرمودەكانی ,لاپەڕە 271 .
18- بچۆرەوە بە (باڤیجا ) لا 57 لە كتێبی ناوبراو .
19- بچۆرەوە بە (علی م ) دیانەتی ئیسلام لا 507 , باوری وایە كە پیاوی موسوڵمان ڕێگەی پێداوە ژنی هیندیو سەر بەئاینی بودشی هەبێ .
20- فیزی(1) كورتەیەك لە یاساكانی موحەمەدی) لا 97 .
21- بچۆرەوە بە (علی م) لاپەڕە 271 لە كتێبی ناوبراو .
22- بگەرێوە بۆ (قورئان 4: 3-ق 23 : 6-ق70: 29- 30 -ق 33 :35 ) هەروەها سەیری بنەماكانی تایبەت مامەڵە كردنی ژنانی دیلكراوی شەرەكان:حەمیدالله,م لە كتێبی ناوبراو بەشی 15 .
23- بگەرێوە بۆ (علی م) لە كتێبی ناوبراو لاپەڕە 549 (مافی پیاوی (خاوەن كۆیلە ) یەكە پەیوەندی سێكسی بە كۆیلە ژنەكانی ببەستێ , چونكە مافی مولكداریەتی ئەوانی هەیە ,
كورتەی یاساكانی موحومودیە , لاهور (1965 ) بەشی دووەم ,لاپەرە
بیللی پەراوێزەكان .(52(Baillie
24- فیزی لە كتێبی ناویراو لاپەرە 47,



25- بیللی لە كتێبی ناوبراو لاپەرە 47.
26- بەراوردی (فیزی) لە كتێبی ناوبراو لاپەرە (198, 199, 202, 210, ) باڤیجا لە كتێبی ناوبراو لاپەرە 360 .
27- بۆ بیللی لە كتێبی ناوبراو لاپەرە (360) بگەرێوە.
28- بۆ (علی م ) لە كتێبی ناوبراو لاپەرە (550) (بەراوێز) بگەرێوە.
29- بكەرێوە بۆ (علی.م) فورمووده لاپەرە 290 .
30- بگەرێوە بۆ (علی .ی) قورئانی پیرۆز ق 4 :34 لاپەرە 183 لەپەراوێزی 523 .
31- بۆ (علی .م) لە كتێبی ناوبراو لاپەرە 362 بگەرێوە.
32 - بگەرێوە بۆ (ق:4: 19).
33- بگەرێوە بۆ (علی .م) لە كتێبی ناوبراو , 574 .
34- پشكی ناوبراو دابەش دەكرێت بەسەر هەموو ژنەكان ئەگەر ئەو پیاوەی كە مردووە لەژنێك زیاتری هەبوو .
35- بگەرێوە بۆ باڤیجا لە كتێبی ناوبراو لاپەرە 136 (پەراوێز)

# بەشی سێیەم

# بارودۆخی ژنانی بەنگلادیش لە ئەفسانە میللیەکاندا

## پێشەکی:

لە دێر زەمانەوە ژن لە هەموو جیهاندا چەوساوە بووە، ئەم بارە ئەگەر چی گۆڕانکاری زۆر بەسەر شێوەکانیدا هاتووە،بەلاّم بە درێژایی مێژوو وەکو خۆی ماوەتەوە جگە لە ژن لەنێو پیاوانیشدا چینی کرێکارەکانیان چەوساوەبووە، هەڵبەت ژنانی نێو ئەم چینەش کەمترین پایەیان هەبووە ئەم رەوشە تا ئەورۆش کاری پێدەکرێت و بەردەوامە. هەریەك لە ژنان و چینی کرێکارانیش زۆر بەدەگمەن لە قۆناغەکانی پێشوودا هەستیان یاخود درکیان بەم کۆیلایەتیەی خۆیان کردووە. ژنان بە هۆی پەراوێز بوونیانەوە کەمتریش درکیان بەو واقیعە کردووە .

سیمای کۆیلایەتی هەمیشە بەهۆی بەردەوامی بە درێژایی سەدان ساڵ، نەوە دوای نەوە، دەقی گرتووە و ژنیش وەکو شتێکی ئاسایی قەبووڵی ئەم وەزعە ژێر دەستیەی کردووە. بۆیە ئێستا ئاسان نیە قەناعەت بە ژنان بکەیت کە پلە دوون ، ئەستەمیشە کە ئومێد و داخوازییەکانی ژنان بیگەیەنێتە ئەوەی ببێتە ئەندامێکی خاوەن مافی خۆی لە کۆمەڵگەیەکدا کە هەمان مافی پیاوی هەبێت لەسەرجەم بوارەکاندا، چوون ژنان پێش ئەوەی سیستمی کۆیلایەتی دروست ببێ دەردی کۆیلەبوونی خۆیان چەشتووە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە بارودۆخی ژنان لەئەفسانە میللیەکاندا لە نێو پرۆسەی هاوسەرێتیدا، دیاری دەکرێت، بە واتایەکی تر قەدەری ژن ، ئەوەیە لە کوێ ئەو پرۆسەیە تەنیا ژن و دایك بێت و





هەموو بایەخەکانی لە نێو چوار چێوەی خێزانەکەیدا بێ و لەسەریەتی هیچ شێوە بایەخێك نەدات بەو ڕوداوانەی کە لە دەرەوەی دیواری ماڵەکەیدا ڕوودەدەن، یاخود هیچ شێوە پەیوەندیەکی توندو تۆڵ و ڕوونی ئەرکەکانی نێو ماڵی نەبەستێتەوە بەو ڕووداوانە. پەیوەندی هاوسەرێتی لێرەدا دەبێتە تەنیا شێوەیەك لە شێوەکانی مل کەچ بوون و کۆیلەبوونی ژنان. چونکە ژن ناچارە قەبوڵی بێ نوایی و ژێردەستەیی بکات لەبەر لاوازی پێگەی ئابووری ، بۆیە گرنگترین شت لە ژیانیدا چوارچێوەی هاوسەریەتیە، کە لە هەناویدا خۆی دەبینێتەوە و رۆڵی دەردەکەوێت .

ئەفسانە میللیەکان رەنگدانەوەی داب و نەریت و بیرکردنەوەی خەڵکن بەگشتی لەجیهاندا و دواتریش دەبنە کلتوری گرنگی ئاییندەی میللەتان و نەوەکانی داهاتوو. دەتوانین لەمیانەی ئەو وێنە زیندووانە وێنەی زەیینی بۆ ڕابردوو دروست بکەین, ژنان لە لادێکانی بەنگلادیشدا تا ئێستاش ئەو ئەفسانە میللیانە دەگێرنەوە، کە ژنە بەسالاّچووەکان لە ڕابردودا بۆ نەوەکانیان دەگێڕایەوە. وا پێدەچێت ئەم ئەفسانانە لە قۆناغی نێوان بوزیەکان و سەرهەڵدانیان لەو ناوچانەدا پەیدا بووبن، واتە لە نێوان سەدەی سێیەم تاکو سەدەی دەیەمی زایینی(1). ئامانج لەو ئەفسانانەش بلاّوکردنەوەی بەها ئەخلاقیەکان بوە کە ئەو کاتە لە کۆمەڵگەی بەنگالی باو بووە(2). ئەم ئەفسانانە دەگمەنن ( بۆنی خونچە و شیعری سەرنجڕاکێش وژیانی لادێ و خۆشەویستی ژنە پاکیزەکان) هەموو ئەم توخمانە لە ئەفسانەکاندا کۆبونەتەوە(3).

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە دیاریکردنی دۆخی ژنانە وەکو دەبینین لەئەفسانە بەناوبانگە میللیەکانی بەنگلادیشدا، لە دووتوێی ئەو ئەفسانانەدا دیارە کە ژنان تەنیا مولکێکن لە دەستی پیاواندا و ئەوانیش بەگوێرەی حەزیان بەکاری دەهێنین، ئەفسانەکان گوزارشت لە هەموو سۆزو هەلوێست و کەلچەری ئەو ولاّتە دەکەن کە لەدێر زەمانەوە لەوێدا باوبوون، هەموو ئەمانە بۆ دڵنیابوون لەو روئیایەی کە ژنان تەنیا وەك مولکێك لەدەستی پیاواندا دەبینیّ(4)، بەهەند وەردەگیرێن.

ئەو چیرۆکانەی لەو لێکۆڵینەوەیەدا هاتوون نموونەی ڕاستگۆیی ئەو چیرۆکە کۆنانەن کە کاتی خۆی ژنە بەساڵاچووەکانی بەنگلادیش دەماودەم لەسەردەمی خۆیان بۆ نەوەکانیان گێڕاوەتەوە(5).

**بارودۆخی ژن : بارودۆخی یاسایی لە هاوسەرێتیدا**

دوای پشکنینی ئەو بوارانەی خوارەوە لەشێوەی ژیانی ژنان لەو چیرۆکە میللیانە، دەتوانین باری ژنان لەیاساکانی نێو ئەو ئەفسانانە ئاوەها دیاری بکەین :

أ. تیژی بنەما ڕەوشتگەریەکان بۆ ژن (کە تایبەتن بەوانەوە)

ب ـ باری ئابوری وبارودۆخی یاسایی ژنان

جـ . بارودۆخی دەروونی

د. ڕۆڵیان وەکو دایك، ئەرك ومافەکانی تریان.

پێش ئەوەی زانیاری دەربخەین پێویستە بزانین کە چارەسەرکردنێکی بەرفراوان بۆ ئەم بابەتە کارێکی قورسە،چونکە بابەتەکانی ئەم ئەفسانانە قەبارە گەورەن، بۆیە لێکۆڵینەوەکە کورت دەکەینەوە بە دیاریکردنی شێوەی گشتی ئەو لایەنانەی پەیوەندی بەودێرە ئەفسانانەوە هەیە کە ئاماژەمان پێکرد.

**بنەما ئەخلاقییەکانی ژنان وەك لەئەفسانەکاندا باسکراوە**،ئەم بابەتە پەیوەستە بەپەیوەندی هاوسەرێتییەوە، وەك مێژوونووسەکان لەسەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوەیان تۆمارکردووە، کە بەشودانی کچان پێش تەمەنی باڵقبوون گرنگترین بنەمایی هاوسەرێتیە لە کۆمەڵگەی بەنگالیدا، یەکێ لەو مێژوونوسانە تێبینی ئەمەی خوارەوە دەکات:

کتێبە پیرۆزەکان (Dharma sastra) کۆکن لەسەر ئەو ڕایەی، سەبارەت بە درەنگ شوکردنی کچە منداڵەکانە وکەمکردنەوەی بەهای ئەو کچەیە بۆ ئاستی سودرا (چینی نزم ) , ئەگەربەبێ شوکردن لەتەمەنی باڵقبووندا لەماڵێ باوکیاندا مانەوە. بۆیە ئەو پیاوانەش کەئەو کچانە دەهێنن یاخود بەدوایاندا دەگەڕێن لەکۆمەڵێ بەنگاڵیدا قێزەونن، زۆر





جارمانەوەی ئەوکچانە بۆماوەیەکی زیاتر لەماوەی تەمەنی باڵقبون دەگاتە ڕادەی کوشتنیان بەدەستی باوکیان، چونکە ئەگەر کچەکان یان خوشکانیان گەیشتەنە ئەو تەمەنە و بەبێ شوومابونەوە بەهۆی هەژاری, یا دەست کورتی ماڵە باوانیان، ئەوا باوك وبراکانیان توشی سزایەك کە لەو نەریت و کلتورەوە بۆیان دیاری کراوە کە ئەوان بە پیرۆزی دەزانن، لە ئەنجامدا کچان دەبێ پێش تەمەنی باڵق بون، بەڵکو پێش ئەوەش بەزووتر شووبکەن(6).

چیرۆکەکان لەئەفسانە میللیەکاندا جەخت لەسەر ئەم تێبینیە دەکەنەوە وێنەی ئەوخەم ودڵە ڕاوکێیەی خانەوادەی ئەوکچانە هەیانە کەماونەتەوە، لە چیرۆکی (ترويض المراءة السليطة) ئەم دڵە ڕاوکێیە بەم جۆرە باسکراوە:–

(ترابانی کچێکە گەیشتۆتە تەمەنی شوکردن وباوکی لە حاڵەتێکی دەرونی ناخۆشدایە، بەهۆی ئەو کچەوە، ئێستا چیبکات؟ بۆیە ناکرێ ئەو کچە لەماڵە باوانیدا بمێنێتەوە تا کاتێکی نادیار، پێویستە لەسەری شووبکات.)

لێرەدا نموونەیەکی تر لەچیرۆکی (کەجالریخا) هەمان شت دووپات دەکاتەوە(7):

(ئەو کچە بازرگانێکەو گەیشتۆتە تەمەنی شوکردن، بۆیە لەسەریەتی شووبکات، چونکە تائێستا ئەم کچەی بێ شووماوەتەوە و تەمەنیشی گەیشتۆتە 12 ساڵ و ئەو تەمەنە ( لەشووکردن لایداوە) لەچیرۆکی (رۆبا ڤاتی) هەمان کێشەهەیە(8):

(کچی شازادە گەورە بووەو 14ساڵێ تەواو کردووەو تائێستا شووی نەکردووە.) دەرو دراوسێ دژی ئەم دواکەوتنەی شوکردنەکەووەستانەوەو بەچرپەوە ئەم مەسە لەیەبووە جێگای باس وقسەیان، چونکە ئەو کچە گەورەیە هێشتاش هیچ بەرنامەیەکی شوکردنی لەئارادانیە، شاژن لەچارەنوسی کچەکەی کەوتە دڵە ڕاوکێ وشەو و ڕۆژی بەناخۆشیەکی زۆر بەڕێ دەکرد).

هەموو ئەوچیرۆکانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە کچان بەکردەوەش زوو بەشوو دەدرێن و هەموو ژیانیان بەشێوەیەکی چاوەڕوانەکراوو قەدەر هێنان لەچوار چێوەی هاوسەرێتی دەسوڕێتەوە، تادەگەنە ڕۆژی کۆتاییان.

باوکەکان پیادەی دەسەلاّتی باوکسالاری خۆیان کردوەو، هەمیشە هەڵدەستن بە دوورخستنەوەی کچەکانیان بۆ دارستانەکان بۆ ماوەی 12 ساڵ. وەکو دەبینین (کەجالریخا) نموونەی کچێکی دوورخراوەیە لەلایەن باوکیەوە بە راویژ لەگەڵ باڵداریك بە ناوی (سوکا – suka) کە پێشبینی دەکات ئەو کچە بەختی بەم جۆرە بکرێتەوە ، دواتر لە دارستان کە بەتەنیا دەمێنێتەوە شازادەیەك دەبینێ ڕاکشاوەو هەموو شوێنێکی جەستەی بەدەرزی داپۆشراوە، لەوێدا و بەیارمەتی(پیاوچاکێك) کە جارناجار لە دارستانەکەدا بەدەردەکەوێ، شووبە شازادە کە دەکات، کە جالریخا لە دڵڕەقی باوکی دەدوێ ودەڵێ:–

بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکم هەبێ بەدەستی باوکی خۆم بەرەو ڕووی مردن ڕۆیشتم، زیاتر لە جارێك قەدەر بۆمردنی بردووم، (جارێکی تریش توشی دوورخستنەوە بۆتەوە بەدەستی مێردەکەی).

چیرۆکی (رۆباڤاتا) بەهەمان شێوە دەگێڕێتەوە :

(پاشا واتە باوکی کچە کە بەڵێن دەدات بۆ بەیانی یەکەمجار چاوی بە چ پیاوێك کەوت کچەکەی خۆی بداتێ، لەبەر ئەوەی چیتر بەرگەی ڕەخنەگرتنی دراوسێ وقسە وقسە لۆکیان ناگرێت، دایکی کچەکەش خەم دایگرتبوو نەوەکو کچەکەی بدرێتە پیاوێك کە شایستەی ئەو نەبێ، دواجار باوکی کچەکەی دا بەپیاوێکی بچووکی خزمەتکاریان بەناوی (مادان) و هەردووکیانی دوورخستەوە بۆدارستانێکی چڕ.

لێرەدا بوارێکی تری گرنگ هەیە لەدابونەریتی ژیانی هاوسەرێتی ئەویش ئەوەیە کەپیاو کاتێ مامەڵەی خراپ لەگەڵ ژنەکەیدا دەکات لەلایەن کۆمەڵەوە رووبەڕووی هیچ جۆرە لێپرسینەوە یاسزایەك نابێتەوە، بەهۆی چاو چنۆکی وخۆپەرستی خۆیەوە. یاخود بەهۆی ئارەزووکردنی





لەفرە ژنیدا. نموونە گەلێکی زۆر لەسەر ئەم ڕەوشتەی پیاوان هەن بەبێ ئەوەی کۆمەڵ بۆ ئەو کردەوانە ناڕەزایی دەربڕێ یاخود دژی بوەستێ. زۆرجار هەست بەناڕەزاییەك دەکەین لەو ژنانەی کە گوێ لەم چیرۆکانە دەگرن ئەم نموونەیەی خوارەوەی باسی دەکەین لەوحالەتە دەدوێ ودڵنیامان دەکات لەڕاستی بوونی ئەم باسە:

چیرۆکی (چوار وشەی دانا) باس لە جەربەزەیی برا بچوکێك دەکات بەناوی (عەلی) کەژنەکەی لای براکانی لەلادێیەك بەجێ دەهێڵێ و لەشارێکی دووردا بەدوای پارەدا دەگەرێ ، دوای ئەوەی گوێرایەڵی چوار ووشەی پیاوێکی دانا دەبێت، زۆر دەوڵەمەند دەبێ و کۆشکێکی بەرز بنیاددەنێ و ژنێکی تریش لەوێ دەهێنێ. دوای (5ساڵ) ژیانێکی خۆش لەگەڵ ژنی دووەم ، لەپڕژنی یەکەمی بیردەکەوێتەوەو بڕیار دەدات بگەڕێتەوە بۆ لای ژنەکەی یەکەمی ودواتر بیبات لەگەڵ خۆیدا، عەلی لەگەڵ دەستەیەك لەبازرگانی دەوڵەمەند خۆی دەشارێتەوەو خۆی وا دەگۆڕێ کەخوشك وبراکانی نەیناسنەوەو دەیەوێ هەڵس و کەوت و ئەمانەتداری براکانی خۆی تاقی بکاتەوە، بۆیەش داوایان لێ دەکات کە ژنەکەی خۆی پێ بفرۆشن، ئەوانیش کە نایناسن براکەی خۆیانەو کۆنترۆڵی چاوچنۆکی خۆیان پێ ناکرێ ژنەکەی پێ دەفرۆشن، لێرەدا عەلی ژنی خۆی جارێکی تر کڕیەوە.

ئەم چیرۆکە گوزارشت لەو ڕاستیە دەکات کە ژنان ئازادی هەڵبژاردنیان نیە وبەتەنیا کالاّیەکن لە دەستی گەورە پیاوانیان کە گەورەیانن، ئەوانەی وەکو موڵکێکی تایبەتی خۆیان مامەڵەی پێ دەکەن.

چیرۆکی (بوکی قەلە رەش) هەمان شێوە هەڵوێست دەگێرێتەوە، کوڕێکی پاشایەك بەناوی (نۆکیب) کچە شایەك دێنێ بەناوی (رافیزا) کەلەجوانیدا هاوتای نەبووە، دوای هێنانی بەماوەیەکی کەم نۆکیب دەچێ بۆ دارستانی نزیکیان بۆ ڕاوکردن، لەوێدا کچێکی جوان دەبینێ ودەکەوێتە داوی، لەواقیعشیدا ئەوکچە جنۆکە بووە (گەر سێکس بکات لەگەڵ مرۆڤدا لە جیهانی جنۆکە دەردەکرێت ) بۆیە شێوەی خۆی گۆڕی

به قەلەرەش تا خۆی بە دوور بگرێت لە شووکردن بە (نۆکیب)، بەلاَم لەگەلْ ئەوەشدا میر قەلەرەشەکەی هێناو هاوڕێیەتی ژنی یەکەمی رەتکردەوە و مامەلْەیەکی خراپی لەگەلْدا دەکرد .

بۆیە رافیزا بەدلْشکاوی دەچێتەوە مالْ باوکی خۆی ، نۆکیبی پیاو لەماوەی 12سالْدا نەیتوانی بچوکترین نزیکبونەوەو پە یوەندی خۆشەویستی بە قەلەرەشەکەوە ببەستێت، لەکۆتایشدا بوکە کەگەڕایەوە سەرشێوە ئادەمیزادیەکەی خۆی چونکە کوڕەکەی خوشویست وقەبولْ کرد وەکو مێردێك، نۆکیبیش ڕافیزای لەمالْە باوانی هێنایەوەو لە خۆشیو ناخۆشیدا پێکەوە ژیانیان بەسەربرد.

دوورخستنەوەی ژنان مەسەلەیەکی زۆر باوی نێو ئەفسانە میللیەکانی بەنگلادیشیە، پیاو وەك سزایەك بۆژنەکەی جێبەجێ دەکرد، کاتێ کە ژنەکان هەلْوێستییان بنواندایە کە لەبەرژەوەندی پیاواندا بوایە. لە نموونەی چیرۆکەکانی دوورخستنەوە (چیرۆکی ئەو پاشایەی منالْی نەدەبوو، شازادەی پایەبلْند پاشا مەیمون)) لەسەدەکانی ناوەڕەستدا ئەم بابەتە لەئەدەبی بەنگلادشدا بلاْو بۆەو لەشێوەی نزیکی کەلتوری زارەکی ئەمڕۆمان دەچێت.

ڕەنگە وا دابنێین کە دوورخستنەوەی ژنانی پالْەوانی ئەم چیرۆکانە بارێکی زۆر قورس‌و بێ ڕەحمانەبێ‌و جێی باوەڕ نەبێ بەلْکو تەنیا لە خەیالْی نوسەری چیرۆکی میللیدا بێ, بەلاْم بێگومان ئەو بێ بەزەییە بەڕاستی ڕوویداوەو خەیالْی نوسەر نەبووە و ئەو چیرۆکانە بە واقیع بەجۆرێکی ترسێنەرو بەڕاستیش حالْەتی ڕابردووی کۆمەلْگەیان دەرخستووە.

زۆرجاردەبینین لەزۆربەی چیرۆکەکاندا ژنانی زیرەك لێهاتوویی خۆیان بەکار دێنن بۆپیرۆزکردنی مێردەکانیان، کۆمەلْگا حەز بە سەرکەوتن وپێشکەوتنی ژن ناکات بەهۆی زیرەکی خۆیەوە، بەلْکو لە کۆن و ئێستاشدا زیرەکی ژنان بەندە بە ئەندامانی نێرینەکانی خێزانیانەوە.



چیرۆکی (ژنی زیرەك) نموونەی ئەم ڕاستیانەیە, ئەم ئەفسانەیە دەگێرێتەوە کەکچە وەزیرێك لە ولاْتێکدا هەموو کات لەبەر هۆشمەنەی وزیرەکی خۆی، باوکی پرسی وڕای پێ دەکرد، هەرکاتێك گوێ بیستی حوکمێکی قورس دەبوو لەلایەن پاشاوە، ڕای خۆی ڕادەگەیاند، لەبۆنەیەکدا کچە وەزیرەکە نوسراێك بۆ شادەنێری و تیایدا دەلْێ : ئەوحوکمەی لەسەرشاعیری داستان (جوشندانا) داوتانە،نادادپەروەرانە بووە تیایدا. پاشا بەدوایدا دەنێرێت وداوای لێ دەکات کەکچە کە خۆی دادگایی کردنەکە بەڕێوەبەرێت، دوای ئەوەش بەوحوکمەی کە کچەکە دەیدات سەرسام دەبێت وداوای لێدەکات شووی پێبکات، بەلاْم پێشوەخت دەیەوێ سزای زیرەکیەکەی بدات، بۆیە کاتێك هەولْ فێل لێکردنی دەدات، بۆی دەسەلمێ کەئەو لەخۆی زیرەکترە و لەوەشدا خۆشەویستی‌یەکەی بۆی زیاتردەبێت وبەڕاستیش دەیهێنێ و..هتد (چیرۆکەکە لێرەدا تەواو نابێ).

لەوەوە دەبینین گرنگیدانی ئەو ژنانە تەنیا ئەوەیە کەمێردەکەیان بپارێزن وپیایاندا هەلْبدەن، بەداخەوە تائێستاش ئەمە ئامانج ونموونەی بەرزە لای ژنانی بەنگلادیش. لەکۆمەلْ پیاوسالاریشدا ئەوە تێبینی دەکرێ کە ئەم چیرۆکانە بەئاگاهێنانەوەی منالاْنە بۆئەوەی بەگێڕانەوەیان ئەم چیرۆکانە لەمێشکی منالاْن بچەسپێ و لەدواجاردا بەبیرکردنەوەیان کاریگەر بن.

لەکۆتاییدا پێش ئەوەی ئەم خستنە ڕووە کۆتایی پێ بهێنین پێویستە ئاماژە بەوەبدەین کەلەوکۆمەلگایەی کەباسمان کرد لەڕێگەی ئەم ئەفسانە میللیانەوە گرنگیدانێکی زۆر بەمندالْ کوڕ واتە مندالْ نێر دەدرێت، هەروەها ئامازەش بەوەی کەهەمیشە ژنان تاوانبارکراون یابەرپرسیاربوون لە نەبوونی کوڕ، دواجار ئەوەش وەکو بەهانەیەك بۆ فرەژنی بەکار هاتووە.

ئەوهێندە نموونەیەی خوارەوە بەسە:

لەچیرۆكی (ئەو ئیمبراتۆرەی كە منالیَ نابیَ) حەوت جار یەك لەدوای یەك ژنی هیَناوەو كوڕی نەبووە تا لەدوا جاردا لەژنی حەوتەمیدا شەش كوڕو كچیَكی دەبیَ، هەروەها لەچیرۆكی (پاشای مەیمون)دا لۆمەی ژنی پاشا دەكریَ بەوەی كەكوڕیَكی لەشیَوەی مەیمون بووە، لەدوایشدا دووردەخریَتەوە بۆ دارستان لەگەلَ ئەوەی كەهیچ تاوانیَكی لەوڕوودداوەدا نەبووە.

ژنی نموونەیی لە ئەفسانە میللیەكاندا ئەو ژنەیەكە قوربانی بەخۆی دەدات لە پیَناوی میَردی وباوكی وهەروەها مندالەكانیشی بۆیە لەچیرۆكی (كەجالریخا) داژنەكە دەبینین حەوت ڕۆژو حەوت شەو بەسەریەكەوە دەرزی لەجەستەی میَردەكەی دەچنیَ بۆئەوەی لەمردن ڕزگاری بیَت، هەموو پاداشتی ئەوەش زیاتر ئازارو خۆنەویستی خۆی وزیاتر لەجاران كوَت وبەندكردنیەتی. ژنی نمونەیی بەنگالی ئەو ژنەیە كە خواردنی خۆش وجۆراوجۆر و شیرینی وكیَك دروست بكات ولەوەش گرنگتر بتوانیَ ویَنەی تابلۆكانی الیبانا بكیَشیَ خۆنەویست وپابەندبیَ و لەگەلَ ئەوەشدا بەردەوام بەلاوازی بمیَنیَتەوە كە باشترین سیفەتی ئافرەتی بەنگالی‌یە.

چارەنوسی ژنان لە ئەفسانە میللیەكاندا وەك لەچیرۆكی (كەجالریخا) دا دیارە، ئازار چەشتنە،( كەجالریخا) بەرهەلَستی ئەو چارەنوسەی خۆی نەكرد وبەرەنگارنەبۆوە چونكە لاوازە وگیانی پالەوانیەتی تیَدانیە، بەلاَم بۆ ئەوەی ژن پاریَزگاری لەویَنە نمونەییەكەی خۆی بكات، دەبیَ ئارام و خۆڕاگربیَ لەكاتە ناخۆشەكاندا كۆنترۆلَ خۆی بكات ئەو حالَەتانەش كە مرۆڤ بۆ لاوازی مل كەچ دەكات. ئەمە ئافرەتی نموونەیی بەنگالیە و ویَنەیەكی نموونەیی نەوەی داهاتووشە.



## كۆتایی

پیَشتر وئیَستاش وولاَتەكەمان (بەنگلادیش) پڕیەتی لەژنانی قوربانیدەرو بەسۆز، كەهەمووكات بەزیندویەتی خۆیان سوتاندوە لەپیَناوی میَردەكانیان لەشویَنی سوتاندنی لاشەكاندا. ئەوكات خەلَكیش سەرسام بووینە بەم خۆكوشتنەیان هەروەها لیَرەدا دەیان نموونەی لە مجۆرەمان  هەیە كە ژنانیَك لەخۆنەویستی و بەپالَنەری خۆشەویستی خۆیان دەكوژن, چەندان نموونەی ترمان هەیە لەو ئەفسانە میللیانە كە ئەو ژنانەیان پیَ گەورەو باشترە، وەكو لەچیرۆكی (كەجالریخا) كەڕەنگدانەوەی پاكیزەیی وخۆنەویستی ژن لەئەفسانە میللیەكاندا پیشان دەدات. ئەوەی گوتمان، راستە بەلاَم بۆچی هانی ژنان بدەین بۆئەوسیفەتە كەخۆنەویستی لای ژن گەورەدا بنیَین كەوای لیَدەكا بۆ هەموو بوارەكانی ژیانی پشت بەپیاو ببەستیَت ؟ قوربانی‌دان هاوڕیَی هەست كردنە بەخۆشی وەكوجۆریَك لەقەرە بوكردنەوەیە لەونموونانە، ڕەنگە ژنان دوای مردنی میَردەكانیان خۆیان بسوتیَنن، چونكە ژیانی ژنان بەبیَ میَرد زیاتر ناخۆش دەبیَ یان لەوانەیە لەبڕوایان دابیَ مردن لەگەلَ میَردەكانیان كۆیان دەكاتەوەو كۆتایی بەناخۆشیەكان دیَنی.

هیچ مرۆڤیَكی سروشتی حەز بەئازار ناكات، بەلاَم كاتیَ كەناتوانیَت لیَی دووركەویَتەوە باشتر وایە بەشانازی و گەورەییەوە ئازار بچیَژیَت، ژنی بەنگالی شایەنی ئەوەن لە داستانەكاندا داهیَنان وئەفراندن بخولَقیَنن چوون ئەوان بەسیفەتی ڕیَزگرتنی خۆیان دەناسریَن نەك بەهیچ سیفەتیَكی دیكە.

### تێبینی و سەرچاوەکان

1-(Dinesh shandrasen) (ئەدەبی میللی بەنگالی ) کالکاتا. 1920 لا53 .
2- لەهەمان کتێب لا45.
3- لەهەمان کتێب لا 77.
4 – لەهەمان کتێب لا 84.
(Lal Behari day)-5 چیرۆکی میللی بەنگالین , لەندەن (1912) پێشەکی .
6- شەهنارا حسێن (ژیانی کۆمەڵایەتی ژنان لەسەرەتای سەدەکانی ناوەراست لە بەنگالدا) کۆمەڵەی ئاسیایی , دەککا. (1985 ) لا 29 .
7- کۆمەلە چیرۆکی میللی بەنگلادیشی ,ئەکادیمیایی بەنجیلا,دەککا 1985 وەرگێرانی دۆکیۆمێنتی بە دەست نوسراو,لا35 و لاپەرەکانی دواییش.
8 – دینش شاندرانس (کیزا) کالکاتا (1923) لا 25 و لاپەرەکانی دوایش .
9- لەهەمان کتێب لا 188.
10- لەهەمان کتێب لا 255.
11- لەهەمان کتێب لا 260.
12- لەهەمان کتێب لا 187 و لاپەرەکانی دوایش .
13- کۆمەڵە چیرۆکی بەنگالین, هەمان سەرچاوە لا 3 لاپەرەکانی دوایش.
14- لەهەمان کتێب لا 24 لاپەرەکانی دوایی.
15-(LoKo sahitya sankalan) ئەکادیمیای بەنگلا (1985) لا 10, 12, 15, 16



16-Thomson holt و هتد, چیرۆکی میللی نیویۆرک لا120, 250 .
17- لەهەمان سەرچاوە لا 51 و لاپەرەکانی دواییش .

## بەشی چوارەم

## بیجوم ڕوقیە، ڕابەری هزر خوازی

لەوتەیەکیدا بەرێز (ئیمداد عەلی) بەبۆنەی ساڵیادی بیجوم روقیە دا دوای کۆچکردنی لە 25ی دیسەمبەری (1932)دا وتی:
(ئەو ژنە تەنیا نیشانەی سەردەمێك نیە، بەڵکو نیشانەیە بۆ بوژانەوەمان )ئەمڕۆ لەگەڵ ئەم وتەیەی سەرەوە کۆکین‌ودانی پێدا دەنێنین لەسەرئاستی نەتەوەیی کە ئەو وەکو چاککارو ریفۆمیستێکی کۆمەڵایەتی, فێرکردنی لەنێو ژناندا بلاۆکردۆتەوەو لەبوژانەوەی بەنگالدا وەك ڕابەرێك بووە.
سیفەتی تایبەتی لە بیجوم روقیەدا (وەك ریفۆرمیستێکی کۆمەڵایەتی و ژنە ئەدیبێك)، بایەخ پێدانی بە پلەی یەکەم بە ئەقلانیەت لەرێبازی تیۆری وپراکتیکی خۆیدا ، ئەو ئەقڵی بەمەحەك دادەنا، بۆپەسەند کردنی یان ڕەت کردنەوەی هەر بیانوویەك. دەبوایە هەر بەبێ جیاکردنەوە یەکێك بێت لەو کەسایەتیە بێ هاوتایانەی مێژوو، کە بەراستی خەباتی لەپێناو پێشکەوتنی شارستانیەتدا کردووە و توانیویەتی خۆی لە تاریکی و خورافیاتی‌و میتۆلۆژی‌و کۆمەڵایەتی و بیروباوەرە کۆنەکانی ڕابردوو ئازادبکات، دڵنیاین لەوەی کەیەکێکە لەوانەی ماندووبونێکی زۆر ئازایانەی بینیوە بۆ ئەوەی یارمەتی بەرەو پێشڤەچوونی کۆمەڵ و وڵات بدات، ئەگەر توانای کەمیش بوو بێ.
ئەوان ڕووبەرووی ئاستەنگ ومەترسی گەورە بوونەتەوە کاتێك کەوێنەی رێگایان بەئەقلانیەت و لۆژیك و توانای ڕەمەکی خۆیان بۆ

بەرژەوەندی و بەختەوەری گشتی کێشاوە. ئەو ڕاستیە لەسەر بوردەی هەموویان دەبینین و دەتوانین بڵێین ژیانی بیجوم ڕوقیا نموونەیە کە لەو چوارچێوەیە. وەکو لە هەندێ زانیاریە تۆمارکراوەکانی لێرە ولەوێ دەبینین سەرسامین بەوەی کەژیانی ئەو ژنە پڕبووە لەململانێ,دوا ڕۆژ دەریدەخات کە بیجوم ماڤ ئەوەی دەدرێتێ ببێ بەیەکێك لەمەزنترین ریفۆمیست بەدرێژایی مێژوو لەمیانەی ئەو توانا و سەرکەوتنانەی و قوربانیدانی خۆی وخۆشەویستی بۆ ئەوانی ترو بەهێزی ئەو لە دان بەخۆداگرتنی و لەسەرووی هەمووشیەوە ڕوون و ئاشکرایی ڕێگاکانیەتی. دوای خوێندنەوەی سەربوردەی ئەو ژنە، دڵنیاین لەوەی کە ئەو بەرەو ئامانجی گەورەی خۆی گەیشتووە، بەپشت بەستن بەبیرو ئەقلێ گەورەی، و بەبڕوای تەواوی بەحەقیقەت وبەهای بەهرەکانی.

دەتوانین بەبێ دوودڵێ دان بەو بنێینن کە ئەو نەیویستوە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ هیچ شتێك یارمەتیدەری بێت بۆ گەیشتنی بە ئامانجی یەکەم وهەرە گەورەی، بۆیە ئێمە هەست دەکەین کەبیرمان دەکەوێتەوە ئەم ژنە ژیانی پڕبوە لەخەبات وگەورەیی کەسایەتی خۆی کە بە نەمریە. هەروەها سەرسام دەبین بەو نموونانەی کە گوزارشت لەقوربانی بەخۆدان و خۆشەویستی بۆخەڵکان وئەوانی تر, و لەسەرووی هەمووشیەوە سەرکەوتنی فیکری وبیڕورایەکانی کە لەکارە ئەدەبیەکانیدا گوزارشتی لێ دەکردن و وەکو بەهانەیەکیش بەقازانجی ئازادی ژنان پێشکەشی دەکرد.

ڕوقیە داوای لەکۆمەڵێ ژنان وکۆمەڵگەی بەنگالی بەتەواوی دەکرد کە ئەو ئەرکەی لەسەریانە جێ بەجێ بکەن ئەویش ئازادکردنی فیکرە لە کۆت وبەندو چەوساندنەوە. بەکورتی ڕوئیاکانی ئەوەی بەیان دەکرد کەئازادی ڕاستەقینە بەتەواوی مەحاڵە بێتەدی بەبێ ئازادبوونی فیکر.

پێشتر لەوسەردەمەدا و لەژێر ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتیە باوەدا مەحاڵ بووە، ڕوقیا ئامانجەکانی بێتەدی. بۆیە هیچ کاریگەریەك نابینین لەژیانی کۆمەڵایەتیدا بەدی هاتبێ، بەتایبەتیش ئەگەر تەماشای ئەم بارودۆخە بکەین کە ئەمرۆ پێی گەیشتوین نەیتوانی کۆمەڵگەیەکی



نموونەیی بچەسپێنێ، یاخود لەڕەگەوە خورافیات و بیروباوەڕی ڕابردوو بسڕێتەوە، کە هەموو کون و قوژبنێکی ژیانی کۆمەڵایەتی بەگەورەو بچوکیەوە تەنیوە وەك لە هەردوو کتێبی (خەونی سوڵتانەو padmaraga) دا گوزارشتی لێ کردووە.

گومانی تێدانیە بیجوم لەسەرماندووبونی خۆی دەستی لە بەرەو پێشەوەچونی کۆمەڵێ بەنگالی یدا هەبووە و ڕێگەی خۆشکردووە بۆبەرەوشارستانیەت بون و زێدەگاڤی ئەو بەرهەڵستکاریانەی کردووە کە بینویەتی، واتە ئەو مەترسیانەی کەڕووبەرووی بۆتەوەو ڕەخنە وناڕەزایی توندوشێوازی جۆراو جۆری سەرکوتکەر کە لە هێزە دواکەتوو کۆنە پەرستەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. ئێستاش هەست دەکەین دوای سەد ساڵ بەسەر لەدایك بوونی ئەو ژنەو پەنجا ساڵ بەسەر تێپەربوونی کۆچی یەکجارەکیدا، ئەو هێزە بەردەوامە لەکاری خۆی، پێ دەچێ ئەو هێزە نادیار بێ ، چونکە لەکاتێکەوە بۆکاتێکی تر بەلاّم بەخێرایی سەرهەڵدە داتەوە،

کەواتە دەتوانین بەبێ سڵ کردنەوە بیجوم بەمامۆستایەکی دڵسۆز و ڕابەرێك لەمێژووی ئەو گەلە دابینێن، بۆ ئەو هەوڵە دڵسوزانەی کە بەتەنیا داویەتی بۆ ئەوەی کۆمەڵ بەرەو پێشکەوتن بەرێت.

ڕوقیە بۆ بەدیهێنانی کۆمەڵێکی نموونەیی پشت دەبەستێت بەبیری مرۆڤایەتی وهێزی هزر ،, ئەمانە بە ئامرازی سەرەکی و بەهای بەرز دادەنێت، لەوەوە کورتەیەك لەبیروڕاکانی خۆی لەسەر کۆمەڵێ نموونەیی لەنوسینەکانیدا پێشکەش کردووین، لێرەوەش لایەنێکی تر لەکەسێتی بێ هاوتایی دەردەکەوێ, روقیەی ئەدیب پشتی بە بیری ئازادی خۆی بەست،لە کاتی هەوڵدانی بۆ دانانی بیردۆزی خۆی لەفەلسەفەدا ، لەودیو خەباتی لەدژی میتۆلۆژیا لەهەمووچینەکانی کۆمەڵداو هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و جیاکاری لەسەر بنەمای ئایینییدا بەرپاکردوە.

ئەو ژنە چینی ڕۆشەنبیری هاوچەرخی خۆی توشی سەرسوڕمان کردووە بەو بەڵگە و شێوازە لۆژیکیەی کە باسی لێوە کردووە. هەروەك

چۆن ئەمرۆش سەرسامی کردووین لەکارە ئەدەبیەکانی کە لەسەر لۆژیکێك بەگوزارشتی بەهێزو بەڵگەی ڕوون وئاشکرا جەخت لەسەر بیروڕاکانی دەکاتەوە. هەتا لەکارە ئەدەبیەکانیشیدا شوێنیك بۆ نامەنتیقیەت نادۆزینەوەو بەو بیرە درەوشاوە لە کارەکانیدا هەن کەهەمیشە هەوڵی گۆڕینی واقیع دەدات بۆ خەیاڵ. لەگەڵ ئەوەی شدا کە خوێندنێکی کەمی وەرگرتوە خۆی فێر کردووە، کە بەمانای ووشە فێر کردن بێت.

هزری ئازادی ئەو خانمە لە مەزنیەوە دەوروبەری ڕووناك دەکاتەوە و لەکارەکانیدا سەردەکەوێت بەسەر نەزانی و وەهم چونکە ئەو پشت بە لۆژیك و حوکمی ئەقڵ و دادپەروەری دەبەستێت.

لێرەدا ئەقڵ سەردارە، نەتوڕەیی ونەڕق و نەگلەیی لەکارەکانیدا نابیندرێت, بەڵکو لەتێبینی سەخت و ڕەق پێك دێ بەڵام کۆمێدیا ئامێز، هەموو ئەمانە ئاماژە بەهەستە بەرزەکانی و جوانی وتوندوتۆڵ ودیسپلین لەکارەکانی دەکەن.

ڕوقیە بەڕاستی هەوڵی دەدا کۆمەڵ بەنگلادیشی هۆشیاربێتەوەو لە گرنگی ومانای پێشکەوتن وشارستانیەت تێ بگات، بیری وەکو شمشێر تیژبێت، بۆ ئەوەی بیری هەڵەو هەڵخەڵەتاندن کە بەرگری لەمیتۆلۆژیا و بیری دواکەوتودەکات، تێك بشکێنی. ئەو ڕای وابوو کەزوڵم و کردەوەی خراپ کاتێك ئامادەییان دەبێ ئەقڵ کۆیلە بێ و کاتێکیش ئەقڵ کۆیلە بوو بەشێوەیەکی خراپ بەکاردێت، بۆیەش ئەگەر ئازادی عەقڵ وبیر نەبوو ئەوا کۆمەڵ نمونەیی دروست نابێ. لێرەوە دەبێ ژن و پیاو بەیەکەوە بەبێ جیاوازی بەدوای حەقیقەت و جوانی و باشی بگەڕێن و بەمەش زانست و زانیاری شەڕوتاریکی بە دەردە نێن، هەموو بەبێ جیاوازی کردن جێ بەجێ دەکەن ئەرکەکانیان ، بەرپرسیاریەتی هەڵدەگرن وبەوەش کۆمەڵ نموونەیی بەدی دەهێنن .

بیجوم ڕوقیە ڕایەکانی بەشێوازێکی ڕوون لە(وتارەکانیدا) دەخاتە ڕووکەجەخت لەئازادی فیکری دەکاتەوە، ئێمە دیسانەوە نەك تەنها





بەڕایەکانی سەرسامین، بەڵکو بەشێوازو گوزارشت کردنی لەدیدو بۆچونەکانی خۆی وبەکارهێنانی بەڵگەی لۆژیکی, بەڕاستی بەڵگەکانی کەوەکو قامچی دەسەڵاتدار وایە لەسەر کۆمەڵ و شەڕانگێزی ئەو قامچیەیوون کردوە لەپشت پەردەی شێوازێکی جنێودان‌دا ، ڕەنگە هەستی کردبێ کەئەوە لەهێرشی توند وزبری هێزە دواکەوتوەکانی نێو کۆمەڵ دەیپارێزێ لە پشت ئەو جنێودان و گاڵتە ئامێزە شێوازەدا گەیشتبوە ئامانجی ڕاستەقینەی خۆی وماناکانی گەیشتبوە خوێنەواران.

وەکو لەپێشەکی (بڵاوکراوەی) کتێبی ((کۆمەڵێ لەکارەکانی روقیا)) داخوێندمانەوە، دواجار سەلماوە بەکارهێنانی ئەو شێوازە جنێودانەی بەکردەوە ئەو سەرکەوتنی تیایدا بەدەست هێناوە، لەلاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی سەردەمی خوێدا کاردانەوە لەڕاکانی وگفتوگۆ کردن لەسەری بەڕوونی دەردەکەوێ دیارە لێرەدا ماوەمان نابێ گفتۆگۆ لەمەڕ شارەزایی بەڵگەنەویستەکانی روقیا بکەین بەڵام ئەمەی خوارەوە هەندێ لە بۆچونەکانی ئەون کەڕای ڕوون و ئاشکران، ئومێد دەکەین لەداهاتودا هەندێ توێژەرەکانمان، لێکوڵینەوە لەکارەکانیدا ئەنجام بدەن :

((ژنان لەئەنجامی رووبە رووبونەوەیان بەناخۆشیەکانی دونیادا، لەئەرکی پەیوەستدار بەخۆیان، جیابونەتەوە، پیاوان یارمەتی بەپێشکەش بە ژنان دەکەن, لەبەرئەوەی ئەوان لاوازن و بەکەڵکی ئیش کردن نایەن, بەوەش پی‌بەبێ لەگەڵ زیاد بوونی پێشکەش کردنی یارمەتی بۆیان، ئەوان زیاتر لاوازتر دەبن ئێمەی ژن لەم وولاتەدا وەکو گەڕۆك وسواڵکەروانین، چەند خوا پێداوەکان بۆ بەجێ گەیاندنی باوەڕە ئاینیەکەیان پێیان بەخشین, ئەوەندە ژمارەی هەژارەکان زیاد دەکات و وای لێ دێ سواڵ کردن دەبێتە ئەلتەر ناتیڤێك بۆ ئیش وبژێوی ژیان بۆ دواجار بۆ وەرگرتنی ئەو سەدەقانە هەست بەشەرمکردن و نەنگی ناکەن. زیادەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین ئاستی ئەم لێکچوونە زۆر بەرزە ئەگەر بەراوردیان کەین بەنموونە گەلێکی هاوشێوەی لەم جۆرە لەکتێبی فەیلەسوفە مەزنەکان. ئەو بەخشینی سەدەقە بۆسواڵکەران و یارمەتی لە

پیاوانەوە بۆ ژنان بەهۆی لاوازیان, هۆکارێك دەزانی بۆ زیاد بوونی ئەم لاوازیەیان. لەهەردوو حالەتیشدا بەهێزەکان واتە (پیاوان) لە میانەی ئەوەدا دەسکەوتی ئایینی ودنیایان دەبیٚ, ئەمەش بەردەوامیەو دەست بەسەر داگرتنی لاوازەکانە ئەوانەی کەیارمەتی لەپیاوان وەردەگرن کە ژنانن.

بیجوم روقیا بەبەکارهێنانی ئەو شێوازەی کە ئاماژەمان پێی ی دا ئەو ڕوون دەکاتەوە، ئەمانەی خوارەوە هەندیٚ بۆچوونی تری ڕوقیای شارەزان لەزاستی زماندا، هەروەها هەندیٚ ڕای خۆش وکۆمپلێکمان بەبەکارهێنانی مانای ڕاستەقینەی ووشە هاتوەکان، پێشکەش دەکات.

زۆربەی ژنانی خاوەن هاوسەر ناڕازین بەرانبەر بەووشەی (ژنی کۆیلە) بەلاٚم من دەپرسم، ئەی (گەورە) مانای چیە کە بۆ (مێرد) بەکاریدەهێنین ، ئەگەر بۆ کەسێکی زەنگین کە ببەخشیٚ بلێین (بەخشندە) یە و بەمێردیشمان ووت (بەخێوکەر) ئەوا لۆژیك دەلٚیٚ بەژن دەگوتریٚ (کۆیلە) و ئەگەر گوتمان ژن دەبێتە خزمەتکار لەپێناوی ئەو پەیوەندی خوشەویستی یەی لەنێوان خۆی وهاوسەرەکەیدا هەیە بێگومان کەسێك ناڕازی نابێت لەو جۆرە بەلێننامەیە، بەلاٚم ئایا پیاویش وەکو هاوسەرێك بڕیاری خۆی نەداوە لەپێناوی خۆشەویستیکە دوایش دەبێتە بەرپرسێك لەچاودێریکردنی خێزانەکەیدا ؟ کەواتە کۆمەلٚ ناوی مێرد دەنیٚ (خاوەن کۆیلە) لەبری ئەوەی پێی بلٚیٚ (کۆیلەی خۆشەویستی).

ئەمەی خوارەوە دیسانەوە چواندنێکی سەرسوڕهێنەری ڕوقیایە :

((کاتێك کە کۆلۆمبس بڕیاریدا ئەمەریکا بدۆزێتەوە ، ئایا بەشێت لە قەلٚەم نەدرا ؟ کەواتەچ گوزارشتێکی ترهەیە بێجگە لە شێتی بۆ ژنێك بیەوێت بگاتە پلەی مەزنی وەکو پیاوان و سەربەخۆیی خۆی بەدەست بهێنی؟))

پێویستە لێرە هەلٚوەستەیەك بکەین، ئێمە مەیلمان بەلای ئەوە دایە کە روقیا بە ریفۆرمیستێکی کۆمەلاٚیەتی لە چوارچێوەی داکۆکێکردن لەمافەکانی ژناندادابناسێنین ، بەلاٚم ئەوە شایستەیی وگەورەیی





کاروچالاکیەکانی ئەم ژنە سنوردار دەکات ووامان لیٚ دەکات لە تەسکترین سنوردا بیبینین.

روقیە درکی بەوە کردبوو کەلاوازی ودواکەوتووی فیکری ژنان کەنیوەی کۆمەلٚن, دەبێتە کۆسپ بۆ پێشکەوتنی گشتی کۆمەلٚ، بۆیە ئەو وەکو ئەندامێکی ئەو بەشە دواکەوتوە لەکۆمەلٚدا نەیهێشتووە بکەوێتە پەراوێز وچالیٚ بیٚ ئومێدی لەسایەی هەولٚی خۆی و فراوانکردنی چوارچێوەی هێزی، بەلاٚم ئامانجی سەرەکی ئەو, پێشکەوتنەی بۆ تەواوی کۆمەلٚ بووە بەژن و پیاوەوە لەم بارەیەوەش دەلٚیٚ:

((ئێمە نیوەی کۆمەلٚین ،کۆمەلٚیش چۆن پێشدەکەوێت گەرئێمە نەجولٚێین ؟ گەر پێی کەسێك زنجیرو کۆتی پێوەبیٚ، چۆن دەتوانیٚ بەولەنگیە بۆدوور بڕوات ؟ جیاوازی لەنێوان بایەخەکانی ئێمە و پیاواندا نیە بەلٚکو یەك شتن و مانای ژیان لای ئێمە و ئەوان یەك شتە)).

روقیە هەولٚدەدات بیروبۆچونی بەشێوەیەکی بەهێز ڕوون بکاتەوە، لەمیانەی پشت بەستن بەلێکچون لەوتارێکیدا بەناونیشانی (ئەردانگی) وای دادەنیٚ کۆمەلٚگە لەژن وپیاو پێکهاتوە و بەیەکەوە (یەکەیەکی ئەندامی تەواون) ئەگەر نیوەی کۆمەلٚ کەژنانن لەچاونیوەکەی تر بەدواکەوتوو مایەوە, ئەوا پێشکەوتنی نیوە کەی تریش بە پێشکەوتن ناژمێردێت ووای لیٚ دیٚ ئاستی ئەم یەکەیەی ئەندامێتی یە لەنگ ببیٚ ولەیەك ئاستی وەك یەك نەمێنێتەوە هەروەها لێکچونێکی دیکە باس دەکات و لەشی مرۆڤ بەعەرەبانەی لێخوڕینی دوو تایە دەچوێنیٚ و جولٚەی عەرەبانەیەك باس دەکات کە لەسەردووتایە دەڕوات تایەیەکیان گەورە یە (پیاو)و ئەوەی تر بچوك (ژن) ئەو عەرەبانەیە لەئەنجامدا ناتوانیٚ بەم شێوەیە دوور بڕوات بەلٚکو لە بازنەیەکی داخراودا (سنوری مالٚ) دەمێنێتەوە.

ئامانج لەم لێکچونە سەلماندنی ئەوەیە کۆمەلٚ پێشناکەویٚ ئەگەر هاتوو هەردوو نیوە لەئاستیدا کە جیاوازیان هەبیٚ, بەلٚکو کومەلٚ لەدەوری بازنەیەکی تەسکی دوور لەئاراستەی باو بۆشارستانیەت

دەخولێتەوە، وبەڕای بیجوم مانەوەی بەم شێوە یە هۆکەی بۆئەوەدە گەرێتەوە کە کۆمەڵی بەنگالی نەیتوانیوە لەخورافیات ولەنێوان بیری دواکەوتوو کۆنەپەرست ڕزگاری بێت، بەوەش زیاتر وزۆرتر کۆمەڵی بەنگالی دوادەکەوێ, لەبەرئەوەی دوورە لە کۆمەڵگە پێشکەوتوەکانی دیکە.

بیجوم ڕوقیا لە هەوڵێ بسەلماندی ناڵوژیکەیەتی ئەو بیڕوباوەڕەی ژنانی کردوەبە کۆیلەی پیاوان, ڕایەکی مەزن پێشکەش دەکات:.

((مەن دان بەوە دادەنێم کەئافرەت پشت بەیارمەتی کەسانی تر دەبەستێ بەهۆی کەم توانایی لەشی, ئەم هۆکارەش بەس نیە بۆ ئەوەی پیاو ببێتە (خاوەن کۆیلە)و ژنیش (کۆیلە)، چوون وەك دەبینین لە جیهاندا هەموو مرۆڤێك پێویستی بەیارمەتی کەسانی ترهەیە بەشێوەیەك لەشێوەکان ئەوەتا دارتاش, تەون کاران, هتد, هەندێ جار پارێزەر پێویستی بەپزیشکە وەك چۆن دکتۆریش پێویستی بەپارێزەر دەبێ, کە واتە، ئایا دەکرێ ناو لە دکتۆرەکە بنێین (خاوەن کۆیلە) یە بۆ پارێزەرەکەو یان بەپێچەوانەوە دابنێین بۆچی دەبێ وا دابنێین ژنان کەهاوبەشی ژیانی پیاوان دەکەن, پیاو بەگەورەی و خاوەنی خۆیاندابنێین ؟.

ژن وپیاو, یەك بۆ ئەوی تر پەیوەندی تەواو دەکات تەواو دەکات و روقیا ئەو بۆچونە لۆژیکیو کاریگەرە باس دەکات بۆ ئەوەی دانانی (کۆیلە و خاوەن کۆیلە) بەکەمی وبێ مانایی سەرکەوتن بەسەر ئەوانە دەربپڕێت. روقیا بانگەوازی ژنانی نیوەی کۆمەڵی مروڤایەتی دەکات کەپشت بەخۆیان ببەستن، بەیارمەتی هێزی هۆشیاریو زانستو ڕاهێنانیان لەسەر بەکار هێنانی هێزی فیکری یا بیری ئازادی خۆیان, ئەگەر نامانەوەیان وەکو بوکە شوشەیەك لەحالەتی ناووشیاریدا دەمێنێتەوە، لەڕاستیدا بەدرێژایی تەمەنی هەوڵێ داوە ڕووناکی بخاتە مێشکی ژنانی زوڵم لێکراو, ئامانجیشی هەمووبون وبیری داگیرکردبوو ئەوە بوو کەژن وپیاو بەیەکەوە ئەو ڕاستیە بناسن کەژیانی ژنان هیچ



مانایەك و بەهایەکی نابێت تاکو ئەوان وەکو بووکە شووشە لەتاریکی وژێر دەسەڵاتی پیاواندا بمێننەوە.

ئەوژنە بۆیریەکی هەبوو بۆ ئەوەی ڕەخنە لەپەیوەندی نموونەیی ئەو چیرۆکەی بەرگویێی خەڵك بگرێ کەلە هیند بڵاوە ئەویش پەیوەندی کوڕێکە کەناوی (راما) وکچەکەش کەناوی (سیتا) یەو دەیانچوێنێ بەپەیوەندی نیوان کوڕێکی منداڵ وکچێکی بووکە شووشەی مردوو بۆ ئەوەی وەسفی بکات کەژیان چۆن بێ بەهادەبێ، کاتێ مروۆڤ دەگۆڕێت بۆ بووکە لاستیکێك, نووسەردەڵێت:

پەیوەندی نێوان بوکەشووشەکەو کوڕەکە خەریکە دەبێتە یەك شت, چونکە ئەگەر کوڕەکە ویستی دەتوانێ کچەکەی خۆش بوێت, لەوەیە ئەو بووکە ئەگەر ون بێت یاخود یەکێك بیبات یابیدزێ کوڕە کە توڕەبێ یارەفتاری توندوتیژ بێت بەرامبەر بەو کەسەو بێگومان بەدۆزینەوەشی بەختەوەردەبێ، بەلاّم بوکەشوشەکە ئیرادەو توانای نیە وناتوانێ هیچ شتێك بۆ کوڕە کەبکات, لەگەڵ ئەوەی کەدەست و پێی هەیە بەلاّم وێنە یەکی جوانی خەیاڵەو هۆش و ئیرادەی نییە.

پێویستە لەسەرئەوژنانەی کە وەکو ئەم بووکەشوشەیە هۆشیان نیە، تائاستێك لەولایەنەی کەژیانو زانست پێشکەشی کردوون خۆیان ووشیار بکەنەوە, تەنیا ئامرازیش بۆ گەیشتن بەزانیاری, ئازادی ئەقڵە لەکۆتو باوەڕی خورافیات و بیری کۆن، دیارە ئەگەر هەموو مرۆڤێکیش بەبێ لەبەرچاوگرتنی لایەنی ڕەگەزی بگاتە ئازادی فیکری خۆی, ئەوا مرۆڤایەتی لەو حالەتەدا دەتوانێ چارەسەر بدۆزێتەوە.

بیجوم روقیە, ئەو ژنە مەزن و بیرئازادە دوایین ووتاری خۆی کە (پێش کۆچی دوایی نوسیویەتیو تەواونەبووە) بەناونیشانی (مافەکانی ژنان) کە لە ڕوژی 8ی دیسەمبەری ساڵێ 1932 دا نوسیویەتی ڕۆژێك لە دوای ئەوە واتە 9ی دیسە مبەری ساڵێ1932 دا کۆچی دوایی دەکات، ئەم ووتارە لەسەر مێزی کتێبخانەکەیدا دەدۆزنەوە، دیارە ئەوەش بەتەواوی دەیسەلمێنی کە ڕوقیا زۆر بەتوندی تێکەلاّوی مەسەلەی ئازادکردنی ژنان

بووە، زۆرترین هەوڵیداوە بۆئەوەی کۆمەکی کێشە ومافەکانی پەیوەندی نێوان ئازاد کردنی ژن‌و ئازادکردنی فیکر بکات و ئەو درکی بەگرنگی ئەم پەیوەندیە کردووە وهەوڵیداوە کەژنان لە کۆت‌و بەندی نەزانی و تاریکیدا ببنەوەو لەژێر کاریگەری سەربەستی‌و ئازادی لایەنی عەقڵی‌و بواری کۆمەڵایەتی بۆ ژنان جێبەجێ بکرێت، واتە لەدونیای ناوەوەو جیهانی دەرەوەی ژن ڕەنگ بداتەوە.

هەموو ئەو بۆ چونانەی لەمەڕمەسەلەی ژنان لەچیرۆکی بەناوبانگی (بادمراگا) کەلەرێگەی پاڵەوانی چیرۆکەکە ، کە ناوی سەدیقەیەو بە(زەینەب)ناوی دەبات , ووشەکان و قسەکانی (سەدیقە) وادەردەکەوێ کە بیرێکی ئازادیخوازو درککردووی هەیە  لەسەر مافی خۆی، وەك ڕوقیە چۆن خۆی درکی بەهەموو ئەو شتانە کردووە کەباسمان لێوە کرد ئەو ژنە ڕایەکانی بەشێوازێکی جبادەردەبڕێت ئەویش بەزمانی ژنە پاڵەوانێکی چیرۆکەکە, کە دیارە وای دەبینێ ئەوە ئاسانترە بۆگەیشتن بە جەماوەی خوێنەران وجولاندنی هەست وسۆزو مێشکیان, (سەدیقە) دەڵێ:

((ئەگەر بۆ کۆمەڵ سەلماندم وخۆم لەو هەموو نایەکسانی‌و نابەرابەریە گێل کرد کەهەیە ئەوا داپیرانمان بۆ کچانمان لەدوا ڕۆژدا کە ئەکەر لێوان لێوبن لە زیندوویی‌و توانایی پێیان دەڵێن (ئێوەی کچ وانەزانن وورەو هێزی خۆتان, بەهایەکی هەیە .. سەیرکەن هەتا زەینەب ناچاربوو پاش ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجە زۆرەی کەبینی, خۆی وبەختەوەری خۆشی بۆ مێردی بکاتە ئامانجی بوونی خۆی. پیاوانیش بێ منەتانە دەڵێن ((ژن هەرچەندێك خۆێندەوارو زیرەك وچالاك‌و پاك‌و پشت بەخۆبەستووبێ، هەر دەگەڕێتەوە لای ئێمە و کڕنوش بۆ پێمان دەهێنێ بۆ ئەوەی داوای ڕزگاربونی خۆیمان لێ بکات بۆیە لەجیاتی ئەوە دەمەوێ بیسەلمێنم کە ژیانی هاوسەرێتی تەنیا ئامانجی گەورە نیە لەژیانی ژناندا و بەرپرسیایەتی خێزانی بۆ ژن هەموو لایەنێکی ژیانی نییە بەڵکو بەشێکییەتی.))



ئەبێ نهێنی ئەو هێزە لەچیدابێ کە سەدیقە والێ ئەکات گەڕانەوەو پەشیمانی بۆ نیە؟.. دیارە نهێنییەکە ئەوەیە کەدەیەوێ بگاتە خوێندن, ((ئەو ژنە مرۆڤێکی خوێندەوارو خاوەن ئازادیەکی ئابوری‌یە لەبەرئەوەی هەموو مانگێك بەرانبەر ئیشەکەی خۆی (ڕوپیات) وەرئەگرێ.))

سەدیقە ناچارنیە پشت بەپیاو ببەستێ بۆ بژێوی ژیانی چونکە ئەو ژنە لەئازادیەکی فیکری‌و ئابوریدا دەگوزەرێنێ. بۆیەش دەتوانێ بەباوەڕێکەوە پێشنیازی مێردەکەی ڕەتبکاتەوە لەم بارەیەوە دەڵێت:

((دەست لەئیشوکاری من مەدە, چونکە خۆم بەرپرسم لەکارەکانی خۆم)) ئەمە مانای ئەوەیە ڕێگای جیاو سەربەخۆی خۆی هەبووەو عەقڵی‌و ویژدانی ڕابەرایەتی ئەو دەکەن.

سەدیقە لەهەڵوێستێکی تردا جەخت لەسەر ڕایەکانی خۆی دەکاتەوە کاتێك کە مێردەکەی ((لەتیف)) ژنێکی تر دەهێنێ بەفەرمانی مامی لەگەڵ ئەوەی گرێبەستی هاوسەرێتی لەگەڵ ئەو دا هەبووە ئەگەرچی مێردەکەی (سەدیقەی ڕۆشنبیر ) بەردەوام داوای لێدەکات بگەڕێتەوە بۆ لای، بەڵام ئەو بەم شێوەیە ڕەتی دەکاتەوە:

((ئەڵقەی دەستم فڕێدا بۆئەوەی ببینێ کەدەشکێ‌و پێم پیاکێشا)).

ئەم ژنە پارێزگاری لە سیفەتی گەوهەری بازن کردووە, هەروەك سەدیقە توانیویەتی پارێزگاری لەخۆی بکات‌و لەژیاندا بمێنێتەوەو سەرکەوێ بەسەر ئەو ناخۆشیانەی کەلەژیانیدا کۆتایی نابێ.

لێرە سەدیقە بەپەخشی ڕووناکیەك دەچێ کەهەموو ئەو ئامانجانەی بەجێ هێنا نەك لەپێناوی گەڕانەوەی لەتیفی مێردی بۆلای خۆی, بەڵکو لەپێناوی زەرورەتی چاککردنی خۆی‌و بوونی خۆی, بۆئەوەی ببێتە نموونەیەکی زیندوو بەرانبەر هەموو ژنانی کۆمەڵەکەی خۆی:

((خێزان, هەمووشتێك نییە لەژیانی ژندا, پێویستە ژن پشت بەخۆی ببەستێت بۆئەوەی مەزنی خۆی بەدەست بێنێ‌و بیری ئازادبێ. پێویستە ژن توانای ئەوەی هەبێ بەئەقڵ‌و لۆژیك بڕوانێتە هەموو بوارەکانی ژیانی خۆی, ئەو خەونەش بەوە دێتەدی کەژن بخوێنێ‌و فێربێ‌و بگاتە

ئابوریەکی سەربەخۆ بۆ خۆی ئەوەش بەهاوکاریو پاڵپشتی ژنانی ئازادیخوازو دڵسۆزو نموونەی بیجوم روقیای گەورەو مەزن .

## تێبینیو سەرچاوەکان

1- کۆمەڵێك لە کارەکانی روقیا ,شاعیر( ئا ,قەدیر) ,ئەکادیمیای بەنجیلا لە ساڵی 1973 بە چاپی گەیاندوە لاپەرە 9.

2- خەونەکانی سوڵتانە , بە ئینگلزی لە ئەنجومەنی کتێب لە ساڵی 1908 دەرچووە .

3- (بادمراجا) نەمانتوانی مێژووی لە چاپ گەیاندنی بزانین .

4-(Matichur)سەیری وتارەکانی کۆمەڵەی بەرگی یەکەمو دوەم بکە , بەرگی یەکەمی لە ساڵی 1905 و بەرگی دوەمی لە ساڵی 1921 چاپکرا .

5-لەهەمان سەرچاوە لاپەرە (7-2)

6- (Matichur-stree abnati) بەرگی یەکەم , کۆمەڵێك لە کارەکانی روقیا لا 17

7- لەهەمان سەرچاوە لا 19.

8لەهەمان سەرچاوە لاپەرە 36 .(Ardhangi)

9- مانای وشەی (ئارادانگی نیوەی ئەندامی پەیوەستە بەهەمووی .

10- لەهەمان کتێب لاپەرە Ardangini.31 -10

11- لەهەمان کتێب لاپەرە 36.

12- لەهەمان کتێب لا 43.

13- لەهەمان کتێب لا 36.

14- یادمراجا ,لەگەوهەرێکی خۆڵەمێشی دەکا.

15- بادمراجا , کۆمەڵێك لە کارەکانی روقیا 452-53.

16- لەخەمان سەرچاوە لا 413.

17- لەهەمان سەرچاوە لا 459.

18- گرێ بەست لە ئیسلام واتە گرێبەستی (پەیوەستنامە) ی هاوسەری

19- لەهەمان کتێب لا 456.



# بەشی پێنجەم

# ژن لەکتێبی سەوزی قەزافیدا

لەزۆرجاردا بانگەشەبۆ دروستکردنی کۆمەڵێکی باشتر پێویستی بە هەڵوێستە هەیە هەروەها دەرگایەکیش بۆ گفتوگۆو ڕەخنە والأدەکات, داخوازی موعەممەر قەزافیش جێگەی بایەخدانە کەداوا دەکات ژن بگاتە یەکسانیو هەڵگری بەرپرسیاریەتی بێت لە کۆماری لیبیادا. هەروەها ئازادبێت لەهەموو شێوە چەوسانەوەیەکی باو کە هەیە لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکانی تردا. ئەو بانگەشەیە دەهێنێ, لێکۆڵینەوەیەکی تێرو ووردی بۆ بکرێت لەپێناو دەرخستنی بنەما فەلسەفیەکەی.

ئەو بەشەی کەتایبەتە بەژن لەکتێبی سەوزدا بەم شێوەیە دەستپێدەکات:-

((ئەوە ڕاستیەو شیاوی مشتو مڕ نیە کەژنو پیاو هەردووکیان مرۆڤن...... جیاکاری لە نێوان ژنو پیاو کارێکی ناڕەوایەو چەوسانەوەیەکی بێ بنەمایە. لەبەرئەوەی ژنیش وەکو پیاو, دەخواتو دەخواتەوەو. هەروەها هەستی خۆشەویستیو ڕقی هەیە, وەك چۆن پیاو ئەو هەستانەی هەیە, ژن بیردەکاتەوەو فێردەبێو تێدەگات وەك چۆن پیاو بیردەکاتەوەو فێردەبێو تێدەگات, ژن وەکو پیاو پێویستی بەجلو بەرگو هۆیەکانی گەیاندنو گواستنەوە هەیە, ژن هەست بەبرسێتیو تینوێتی دەکات وەك چۆن پیاو هەستی پێدەکات)).

تا ئێرە گوتەیەکی دروستە سەبارەت بەبارودۆخی ژنان , ژن و پیاو هەردووکیان مرۆڤن, پێداویستی و توانستیان وەکو یەکە, هەریەکەیان بیردەکاتەوەو فێردەبێ و تێدەگات و هەستەکانیان لەزۆڕ ڕووەوە لەیەك دەچێ

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە کەدەبینین بیرمەندێکی لیبراڵ لەبڕگەی دووەمدا بۆچونێکی تەواو پێچەوانەبنوێنێت و جەخت لەوە بکاتەوە کەجیاوازیەك لەنێوان ژن و پیاودا هەیە, کتێبی سەوز دەڵێ:

((جیاوازی سروشتی ئەوەیە کەژن مێینەو پیاویش نێرینەیە, کتێبەکە ئەو جیاوازیە سروشتیە بەم جۆرە باس دەکات:

1–ژن بەو سیفەتەی مێیە, سوڕی مانگانەی دەبێ.

2–ژن سکی دەبێ, ئەوەش وای لێدەکات بۆماوەی ساڵێك سست و لاواز بێ.

3–بە مەمکەکانی شیر دەداتە مناڵەکانی و بایەخی پێدەدات و لێی جیانابێتەوە.

بەڵام پیاو وەك ژن سوڕی مانگانەی نیەو سکی نابێ و شیر ناداتە مناڵەکانی و بەوشێوەیەی ژن پەروەردەیان ناکات.

کەواتە کتێبەکە ئەوحاڵانە دەخاتە ڕوو کە پەیوەستن بەجیاوازی بایەلۆژی نێوان ژن و پیاو, تیشك دەخاتە سەر ئەوەو دەڵێت:

((سروشتی ئافرەت یەکسان دەبێ بەخودی مێینەبوون) ئەو سروشتە سیفەتی لێکچوونی ژن لەگەڵ پیاودا ناگرێتە خۆی وەکو ئەوەی کەلەسەرەتادا کتێبەکە باسی کردووە.

((ژن وەکو پیاو بیردەکاتەوەو فێردەبێ و تێدەگات, هەروەها بەشداری هەمان پێداویستی و هەستەکانی دەکات)), دیارە ئەوە لۆژیکی نیەو گۆڕانێکی چۆنیەتیە لەبیروبۆچووندا.

بەدرێژایی مێژووی فەلسەفە لە پێشتر و ئێستاشدا ووشەی (سروشت) سەرچاوەی مشتومڕی قوڵ بووە, کەدیارە هەندێ لەنیشانەکانی, لەقوتابخانە فیکریە جۆراوجۆرەکانەوە وەرگرتووە,



ڕێبازی فەلسەفەی (ڕەواقیەکان) بایەخ بەلایەنی عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ دەدات و وای دەبینێ کەژیانی ئەقڵانیەت پشت بەبیردەبەستێت و پێداویستیە سۆزداری و هەستەکانی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە, قوتابخانەی فەلسەفەی ئەزمونگەرایی کە (هۆبزو هیوم) دەگرێتەوە, وای دەبینێ کەسروشت هەموو لایەنەکانی مەردووم دەگرێتەوە, واتە(( کردەوەکانی, توانای, خەوشی, بیرکردنەوەی هەروەها هەست و سۆزەکانی...هتد)), ئەو قوتابخانە فەلسەفیە, ژیانی ئاسایی وا دەبینێ کە مرۆڤ بەیارمەتی عەقڵ هەموو پێداویستیە سۆزداریەکان بەجێ دەهێنێ واتە (ئەقڵ کۆیلەی سۆزە), بەڵام لێرە لەکتێبی سەوزدا تێگەیشتنێکی دیکە بۆ سروشت دەبینین کەتەنیا پشت بەئەرك و چالاکیە بایەلۆژیەکانی مرۆڤ دەبەستێت واتە (وەچەنانەوە, مانەوەی نەوەی داهاتوو پارێزگاری) و مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤ لەیەکەمباردا تیۆری جیهانی سێی نوێ دەبینین! بەڵام ئایا ئەمە بەم شێوەیەیە؟ هەروەها کتێبی سەوز لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەهەر کچێك شوکردن و دایکایەتی و سکبوون و وەزیفەکانی ژنان واتە دەست لەڕۆڵە سروشتیەکەی خۆی هەڵگرێ ئەوا ئەمە بەلادانێك لەمۆراڵ و ڕەوشت دادەنرێ لەو چوارچێوەیەدا, دیارە قەزافییش لەڕوانگەی جیاوازیە سروشتیەکانەوە داوا دەکات ژن خزمەتی پیاوبکات لەبەر ئەوەی ((ژن نەرم و نیانەو بەئاسانی دەترسێ و بەئاسانیش دەگری, بەگشتی ژن بەسۆزن و پیاویش بەهێزن بەحوکمی سروشتی زگماکیان)).

کتێبی سەوز داوا دەکات ژن وەکو خۆی بمێنێتەوە:–

((ژن وەکو گوڵی کراوەن , بۆ ڕاکێشانی دەنکۆڵەی سپێرم و بەرهەم هێنان دروستبوون)) بەڵام بەڕای ئێمە ئەم بیرکردنەوەیە سەردەمی بەسەرچووە ((بیری ئەوەی کەژن وەکو گوڵە هەنگ (پیاو) رادەکێشێ)) بیرێکی ڕەتکراوەیە لەلایەن مرۆڤی ڕوناکبیرو ئەقڵانیەکانەوە, ئێستاش ئەگەر هەندێ کەس ئەو بیرکردنەوانە قەبووڵ بکەن, ئەوا زۆربەی زۆری داخوازیانی ئازادی ژنان بەگشت لایەنەکانیانەوە, بەرپەرچی دەدەنەوە. وەکو چۆن دەگوترێ پیاوان بۆ خۆجوانکردن و سەرنج ڕاکێشانی ئەو

ژنانەی کەبۆ کۆکردنەوەی شیلە لەگوڵێکەوە دەچنە گوڵێکی تر, پەنا بۆ ئامادەکراوی جوانکاری‌و هەمووجۆرە پۆشاکێك دەبەن, ئایا ئەمە بەڕەفتارێکی نائاسایی پیاو دادەنرێت؟ هەروەك ئەمە بەهۆی گونجانی کۆمەڵایەتی کەپشت بەجیاکارە بایەلۆژیەکانی نێوان ژن‌و پیاو دەبەستێت.

بەراوردی نێوان جیهانی گیانەوەران‌و ڕووەك لەگەڵ مرۆڤ لەزۆربەی کاتدا لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەدا دەمانگەیەنێتە هەڵەی گەورە, ئەم بەراوردانە لەکتێبی سەوزدا دووبارە دەبنەوە, مرۆڤی ئەقلانی دەخوازێ زیاتر تێڕامانی بایەلۆژی‌و چێژی هەستی هەبێ‌و دەیەوێ لەهەموو بوارەکانی ڕۆشنبیری‌و هونەری‌و جوانکاریەوە پێش بکەوێ. هەرچی ڕووەك‌و ئاژەڵەکانن لەئاستێکی نزمدان, بەڵام پیاو ئەمە لەبەر بەرژەوەندی خۆی لەبیر دەکات.

زۆربەی زانا دەروونناس‌و کۆمەڵناسەکانی جیهانی نوێ پێیان وایە کە گونجانە کۆمەڵایەتیەکان‌و (هۆکاری تایبەت بە زانستی بۆماوەیەیی کە بەدرێژایی سەدەکان ئەوە ئەنجامی ئەو گونجانەیە, بەرپرسی سەرەکین لەدروستبوونی بیری (ڕەوشتی‌و ئاکاری نموونەیی نێر) یان (ڕەوشت و نمونەیی مێینە) ئەمڕۆ گرانە دروستیی ئەو بۆچونە بسەلمێنین کەسروشتی زگماکی ژنان بۆ ڕاکێشانی پیاوە, پیاویش ژن بۆ بەکارهێنان‌و تێربوونی خۆی‌و مانەوەی بەکار دەهێنێ, قەزافی لێرەدا دەڵێ:

((ئێستا کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتیدا بەچاوی کاڵاوە سەیری ژن دەکرێ, واتە کاڵایەکە بۆ کڕین‌و فرۆشتن, لەڕۆژئاواشدا دان بەمێینەیی ئەودا نانرێت)) ئەم تێبینییە دەهێنێ هەڵوەستەی بۆ بکەین, وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکان لەڕۆژئاوادا کەزۆر پولەکین بەوڕادەیەی ژن‌و پیاو تەنیا وەکو ئامێرێك بۆ بەرهەمهێنان بەکاری دەهێنن ,بە جۆرێك کە خەریکە کرداری داماڵینی سیفەتە مرۆییەکان هەڕەشە لەشارستانیەتی ڕۆژئاوا دەکات, بۆیە بارودۆخی ژن لەڕۆژئاوادا خراپترە. چونکە ئەو بەهەرزانترین





سەرچاوە بۆ کرێ دادەنرێت‌و ناچارە ئەو فشارە لەبەر زۆری فشاری ئابوری لەکۆمەڵەکەی, قەبووڵکات.

ئەمەش زۆربەی کات کۆسپ دەخاتە بەردەم ژن کەناهێڵێ چێژی دایکایەتی ببینێ.

بارودۆخی ژنان لەووڵاتانی پێشکەوتوو زۆر باشتر نیە, بەڵکو درێژکراوەی موڵکەکانی خاوەنەکەیەتی‌و ئەوان ئەندامی خێزانێکن کەباوکسالاریە شوێنی یاساییان نیە, منالی ئەبێ بەڵام مافی یەکسانی وەکوپیاو لە سەر منالەکان نیە, بەدەگمەن نەبێ کاری دەست ناکەوێ, تەنیا هەلێك لەبەردەمیدا ئەوەیە کەبەسروشتی خۆی بژی ئەویش منالی ببێ‌و بەخێویان بکات‌و ژیانی لەسنورێکی تەسکدابێ و هیچ شتێکی دابینکراوی لەژیاندا نەبێ, ئەو تەنها مێیەو مرۆڤ نیە

(( ژن لەووڵاتی پێشکەوتوو دەبێتە ئامێرێك نەك مرۆڤێکی ڕاستەقینە, ژن لەوڵاتانی نیمچە پێشکەوتوشدا ژیانێکی خراپ وەکو زۆربەی ڕووەك‌و گیانەوەر نەك وەکو مرۆڤێك, دەباتەسەر. ئامانجی تایبەتی خۆی نیە )), ئەم تێبینیانە ڕاستیەکی باوەڕپێکراون لەدونیای هاوچەرخدا بەڵام ئێستا بۆ ڕۆڵی ژن‌و پیاو لەتیۆری جیهانی سێدا, جیاوازی زۆر دەربارەی ئەو ڕایە بیرتەسك‌و باوانە هەیە.

کتێبی سەوز تێکەڵکردنی ڕۆڵی ژن‌و پیاوی لە دژی یاساکانی سروشت قەبوڵ ناکات‌و هەر هەوڵێکیش بۆ ئەوە ڕەت دەکاتەوە بە هەڵوێستێکی تەواو ناشارستانی‌و دژ بە یاساکانی سروشت‌و وێرانکەر بە ژیانی مرۆڤایەتی دەزانێ ئەو پرۆتستۆ کردنە بێ بەڵگەو ناتێگەیشتوانەیەو وەکو پێویستیشە فاکتەرەکان ڕوون نەکاتەوە , کتێبەکە تەنیا تیشك دەخاتە سەر جوانی لەش‌و لاری ژن‌و خۆرسکی لاوازی ژن, وەك ئەوەی گرنگترین سیفەتی سروشتی ئەو لاوازی بێ, بەڵام بۆ ئەو ئافرەتانەی کەڕۆشنبیرو تێگەیشتوون, زیرەك‌و لێهاتون چی ڕوودەدات؟ یان چی دەگوترێت؟ ئەگەر هەوڵی پێشکەوتنی ئەو ئامادەکاریانەی دا بۆ ڕازی بوونی خۆی ئایا تۆمەتبار دەکرێت بەپشت

گوێ خستنی سروشتی خۆی؟ ئایا زەرەری گەورە دەکات ئەگەر توانا تایبەتیەکانی خۆی پشت گوێ بخات؟ ئەمە پرسیارێکی زیندووەو پێویستە لەبەرچاوی بگرین, ئەگەر قەبووڵی روئیایەکی دیاریکراوی ڕۆڵی ژن‌و پیاومان کرد, ئەوا قەبوڵی ئەو ڕایە دەکەین‌و پابەند دەبین, کەتواناکانی ژن دیاری دەکات و لەچوارچێوەی سنورێکی تەسکدا دەیهێڵێتەوەو ئەو سنورەش پێی دەگوترێ سروشتی ژن, سروشتی ژنیش ئەوەیە کەبیردەکاتەوەو فێردەبیٚ‌و تێدەگات. و دەتوانرێ ئەگەر گەشە بەو توانایانە بدرێ وەکو ئاستی پیاوی لیٚ بێت, کۆمەڵ ئەگەر پێشکەوتووبوو ئەوا دان بەو ڕاستیانە دادەنێت‌و پێویستە کۆمەڵگە پێشکەوتوەکان لەئێستاو داهاتوودا, کاتیٚ کەپلان بۆ بەرنامەکانی خۆیان دادەنێن, ئەوە لەبەرچاوبگرن. کتێبی سەوز لەوبارەیەوە هەژارە, قەزافی لەهەوڵی لابردنی هەندێ لەو هەڵە تێگەیشتنانەیە لەبارودۆخی ژنان, لەکتێبەکەیدا دەڵیٚ:

(کتێبی سەوز ئامانجی کۆیلەکردنی ژن نییە, بەڵام دەیەوێ لەکۆت‌و پێوەند, ئازادی بکات‌و هەروەك هەوڵی دانانی ئەلتەرناتیڤێك, بەیان دەکات, کاتیٚ کە دەبینیٚ ژن لەوەزعێکی ناهەمواردایەو حەز بەکەمکردنەوەی ئەرکەکانی دەکات‌و ئازادی هەڵبژاردنی پێدەدا, بەم جۆرەش دەبینین وەك ژن مامەلە دەکات (7) .

هەروەها دەبینین دۆخەکە لە کۆمەڵگەشدا دەگۆڕێ وژنان لەئەوروپاو ئەمەریکاو هەر شوێنێکی تر بەیەکجاری لەئیشکردن‌و ناو کارگەکان بەتایبەتی (کارگەی ئاسن‌و چەك‌و رەساسەکان) وازیان هێناوە, لەکاتێکدا کتێبی سەوز ڕایەکی جیاواز دەدات‌و جەخت لەوەدەکاتەوە کەبارودۆخی ژنان لەدونیای هاوچەرخدا لەگەڵ سروشتی ژن یەك نایەتەوە, بەڵام قەزافی پاش ئەوە روونیدەکاتەوە کە ژن پێویستی بەهەڵبژاردنی هیچ ئەلتەرناتیڤێك نیە, بەهۆی باس نەکردن‌و گوێ نەدان بەم روونکردنەوەیە, تێنەگەیشتنێك ڕوودەدا, قەزافی دەڵێت:





((تیۆری جیهانی سیٚ ئامانجی کەمکردنەوەی ئەرکی ژن‌و پێدانی ئازادیی هەڵبژاردنە), ئەگەر ژن ئازادی هەڵبژاردنی پێدرا, ئەوا ئەوە هەڵدەبژێرێت کە وەك ژنێك هەڵسوکەوت دەکات‌و کەسێکی تەواو و پێگەیشتوو هەڵدەبژێرێت, ئەوە خالێکی زۆر گرنگە لەتیۆری ئەقلانیەتی مرۆڤایەتی کەداوای یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەز لەڕووی ڕامیاری‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتیەوە دەکات.

ئەگەر ژن ئازادی هەڵبژاردنی پێدرا ئەوا هەرگیز ئەوە هەڵنابژێرێت کەلەکارگەیەکی چەك‌و تەقەمەنی دروستکردن ئیش بکات, بەڵکو ئەو لەناخی دڵەوە باوەڕی بەئاشتی هەیە, نایەوێ رۆڵەکانی بیٚ بەزەییانە بکوژرێن, ئەو رۆلانەی کەبەهەموو سۆزو خۆشەویستییەکەوە چاودێری‌و پەروەردەی کردوون, تەنیا ژن دەزانیٚ کەچەند لەسەریەتی بۆ پێگەیاندنی منداڵەکانی‌و مانەوەیان لەژیان, خۆی لەبیربکات‌و قوربانی ببەخشیٚ. بۆیە دەبینین لەجیهانی هاوچەرخدا کۆمەڵەو ریٚکخراوەی پێشکەوتووی ژنان هەڵمەتەکانی ئاشتی جیهانی بەرێوە دەبەن , ژنان نایانەوێ هیچ کەسێك تەنانەت پیاوانیش لەکارگەکانی چەك‌وتەقەمەنیدا کاربکەن. (نەچەك, نەجەنگ) ئەمە مەزنترین شتە بۆ ئەوانەی ئاشتیان خۆش دەوێ.

مەسەلەی ئازادی هەڵبژاردن کەتیۆری جیهانی سێیەمە زۆر گرنگە.(8) ژن ئازادە لەکۆمەڵەکەیدا, بەلام ئازادە بۆ چ ئیشێك؟ بۆئەوەی ژیانێکی سروشتی بژی؟ ئازادە کە (مێ) بێت؟

بۆئەوەی وەلامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە پێویستە لەبارودۆخی ژنانی جەماوەری لیبیادا بکۆڵینەوە:

کتێبی سەوز زۆر شت نالیٚ دەربارەی سروشتی ئازادی هەڵبژاردن لە وتارکێدا, خاتوو (فەیمە ئەلبیتار) لەمەڕ(( ژن لەچوارچێوەی تیۆری جیهانی سێدا)) دەربارەی بارودۆخی ژنانی ناوجەماوەری لیبیایە و تیایدا پیادەکردنی ئازادی هەڵبژاردن لەلای ژن بەجوانی ڕوون کردوٚتەوە.

خاتوو ئەلبیتار دەڵیٚ: ئەمجۆرە چارەسەرانە (چارەسەری کێشەی ژن لەولاتە پیشەسازی‌و تازە پێگەیشتوەکاندا پێویستی بە ئازادکردنی ژن

هەیە لەهەموو ئەو کۆتانەی کەرێگرن لە بەردەم بەشداری پۆزەتیڤانە لەجیهانی ئەمڕۆدا, بەشداریکردن لەگەشەکردنی کۆمەڵایەتی, چونە نێو ململانێیەکان لەپێناوی بەدەستهێنانی نموونەی باڵا بەڵام بەبێ پشتگوێ خستنی سروشتی مێینەیی خۆی, ئەمە چارەسەرێکی نمونەییەو پێویستە کەسیش لاری لێی نەبێ. ئەمڕۆ توندڕەوەکانی ڕۆژئاوا کەلەبزوتنەوەی ئازادکردنی ژنان کاردەکەن مێینەیی خۆیان ڕەتدەکەنەوە (9), بەڵام ئەم ڕەتکردنەوەیە هۆیەکی باشە بۆ خۆسەلماندن لەبەرامبەر جیهاندا کە پیاو دەسەڵاتدارە تیایدا, ژنیش مرۆڤە ومێینەیی ئەویش بەشێکە لەکۆی کەسایەتی ژن خۆیدا.

ڕەتکردنەوەی مێینەیی مانای ڕەتکردنەوەی خوود نیە وەکو مرۆڤێك ئەمەش نابێتە کۆسپ لە بەردەم گوزەرانی ژیانێکی پڕ مرۆڤایەتی, ڕەتکردنەوەی مێینەیی تەنها ئامانجێك نیە, بەڵام ئامانجی بەدەسهێنانی ((نموونە باڵاکانە)) کەوەك نموونەکانی خاتوو ئەلبیتارە پیشانمان دەدات, کەواتە هیچ بۆچونێکی جیاواز نیە لەئامانجدا, هەروەك ئامانجی ئەو توندڕەوانەش پێکهێنانی کۆمەڵێکە کەژن تیایدا وەك مرۆڤێکی تەواوو کامڵ سەیربکرێت. لەگەڵ بایەخی تەواو بەمێینەیی و بڵندسەیرکردنی.

خاتو ئەلبیتار بەمشێوەیە بارودۆخی ژنان لە ناو جەماوەری لیبیادا کورتدەکاتەوە(10):

1–ژن هاوبەشی پیاوە لەپیادەکرنی دەسەڵات لە لیبیادا, ئەنجوومەنی میللی لەئەندامانی ژنو پیاو پێکدێ کەئەوێش سەرچاوەی وەرگرتنی بڕیاری سیاسیە, بێگومان ئەمەش دەیسەلمێنێ کەژنان ماف سیاسیان هەیە.

2–یاساکان هیچ جیاکاریەك لەنێوان ژنو پیاودا ناکەن بە تایبەت لەکارو کرێی کارکردن, ئەوەش ماف یەکسان لەکرێو هەڵبژاردنی کار دابیندەکات .



3–لەیاسای کاردا بەخشینی مۆڵەتی دایکایەتی بەموچەی تەواوو چاودێری پزیشکی بێ بەرانبەر بۆ پارێزگاری کردنی ژنانو تەندروستیانو ئاسانکاری بۆئەنجامدانی کاری رۆژانەی سروشتی خۆیان,هەیە هەروەها ژن ئاسانکاری پتریش لەماوەی ساڵێکی دوای مناڵبوونی لەکاردا بەدەست دەهێنێ (واتە هەر کاتێ مناڵ پێویستی بەچاودێریو پەروەردەی بوو ئەوا یارمەتی تەواوی پێدەدرێت ,ئەمەش یارمەتی دەرە بۆپاراستنی سروشتی خۆی.

4–((پارێزگاری وڵات ئەرکی هەموانە بەپیاوو ژنەوە, بەگوێرەی تواناکانیان)) ئەمە داننانە بەوەی کەژن دەتوانێ پارێزگاری لەووڵاتەکەی بکات. واتە ئەو لەپاڵ سیفەتی مێینەی خۆیدا, سیفەتی پۆزەتیڤی هەیە.

ئەگەرکۆماری لیبی توانی ئەم ئامانجانە بەجێ بهێنێ ئەوا بۆ ژنان کۆمەڵگە دەبێتە کۆمەڵگەیەکی نمونەیی, چونکە مێیەتی شتێکی پڕبەهایە, بەڵام لەڕاستیدا هەمووشتێکی ژن نیەو نابێ ببێتە کۆسپێك و لەبەردەم ژندا دابنرێت لەچوارچێوەی مرۆڤی هاوتا لەگیانلەبەرەکانی تر ژن لەوە زیاترە کەتەنیا مێ بێت, بەڵکو ژن ئەمڕۆ بەشداری لەگەڵ پیاودا دەکات لەزۆر لەو سیفەتانەی لەمێینەیی تێدەپەڕێنێت, بەمەش چەوسانەوەی ژنان لەنێوکۆمەڵ کەم دەبێتەوە ئەویش گرەنتی پێشکەوتنی تەواوی تواناکانی پێدەدات, لەگەڵ مێینە خۆی.

وا دیارە قەزاف کە داڕێژەری تیۆری جیهانی سێیەمە , درکی بەگرنگی ئازادی ژنان لەکۆتی کۆمەلگەدا کردووە, هەروەك هەوڵەکانیشی چارەسەرن بۆ کێشەکانو شایانی ستایشکردنن, بەڵام بەداخەوە پێ ناچێ فەلسەفەکەی جێگیرو هاوئاوازبێ لەگەڵ داخوازی بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە گەورەو مەزنە .

## تێبینی‌و سەرچاوەکان

1- م.ئــا قـــەززافی , کتێبـــی ســـەوز, تـــەرابلوس , لیبیـــا ,لا92,
گواستنەوەکەی بە شێوەی حەرفی نیە و لە ئینگلیزیەوە وەرگێردراوە .
2- لەهەمان کتێب لا 103.
3- لەهەمان کتێب لاپەرە 105.
4- لەهەمان کتێب لاپەرە 104.
5- لەهەمان کتێب لاپەرە 104.
6- لەهەمان کتێب لاپەرە 105,
7- کـۆنگرەی جهـانی لـە بـەنغازی : کتێبـی سـەوز(1-3 ئوکتۆبـەری 1979
بەرگی 2 , تەرابلس , لیبیا لاپەرە 177.
8- لەهەمان کتێب لاقەرە 124-134.
9- بەهەمان کتێب لاپەرە 129.
10- لەهەمان کتێب لاپەرە 133, (ئەوانەی ماوەش ).



## بەشی شەشەم

## پەیوەندی ژن‌و پیاو لەئەدەبی هاوچەرخی بەنگلادیشدا

پێش هەر لێدوانێك لەسروشتی پەیوەندی نێوان ژن‌و پیاو لەئەدەبی چیرۆکدا, هەندێ لەبۆچونە تیۆریـەکان دەخەینـە روو کەئێستا بوارێکی فراوان بۆ گوزارشت کردن لێی رەخساوە ,

دەتوانین سێ بۆچوونی ڕوون دەست نیشان بکەین:

بۆچـونی یەکـەم گریمانەیـەو بۆچـوونی دووەم دژیـەکی‌و بۆچـوونی سێیەم, ئاوێتەییە .

تێڕوانینـی بـاو لەسیسـتمی کۆمەڵایـەتی فێمێنیزمیـدا "گریمانەییـە" واتە بۆچوونی یەکەمە کە دەڵێ:

((پەیوەنـدی نێـوان ژن‌و پیـاو لەبنەڕەتـدا پەیوەندیـەکی جەسـتەییە , جەستەی ژن وەکو پارچە زەویـەکی چێنراو وایـە کە پیاو تیایـدا توانـای هەسـتی خـۆی دەدورێتـەوەو بەختـەوەردەبێ‌و وەچـەی بـۆ دەنێتـەوە بـۆ ئەوەی مرۆڤایەتی بەردەوامی هەبێ, بەگوێرەی ئەم تێڕوانینـە, لەسـەر ژن پێویستە پارێزگاری لـەجوانی لەشـی‌و ڕازاندنـەوەی بکـات ولـە بەرانبـەردا پاداشـتی ئـابوری‌و کۆمەڵایـەتی دەدرێتـەوە, کـەمێردبۆی دابـین دەکـات هـەروەها پێویسـتە لەسـەر ژنـان چاودێری وەچـەی پیاوەکـە بکـەن, بـەڵام

ئەوە هیچ مافێك بە ژن نابەخشێ سەبارەت بەمنداڵەکانی, دەکرێ ئەوجۆرە پەیوەندیەی نێوان ژنو پیاوبە (تیۆری جەستەیی)ناو ببەین چونکە جەخت دەکاتەوە لەسەر جەستەی ژن دەکاتەوە بۆ راکێشانی سەرنجی پیاو, هەروەك بەڵگە و پاساوی دابینکردنی پێداویستییە سێکسییەکان بۆپیاو و چێژوەرگرتن, بەگرنگی پارێزگاری لە وەچەکانیان دەزانێ.

تیۆری دووەم : دژیەتی (تیۆری ناجەستەیی)یە کە ژن وەکو زەویەکی چێنراو بۆ پیاو دانێ, بەڵام دان بەپێداویستیو سێکسیەکانی نێوان ژنو پیاودا دەنێ لە پەیوەندیە مرۆییەکانی نێوانیاندا .

سەرنج ڕاکێشانی لایەکیان بەرانبەر بەرەگەزەکەی تریان کورت نابێتەوە, ژن دەتوانێ لێرەدا ڕۆڵێکی بەرچاو ببینێ لەدابینکردنی ئارەزووەکانی خۆیدا ئەوگریمانەیەی سەبارەت بەمافی پیاو لە جەستەی ژناندا ڕەتدەکاتەوەو پیاویش دەتوانێ خۆی بەدوور بگرێ لەسەرنج ڕاکێشانی جەستەی مێینە, ئارەزووەکانی ئاڕاستەی نێرینەیەك بکات (سێکس لە گەڵ هاورەگەزەکەی خۆی) هەروەها دەکرێ ئەم تیۆرە شێوەیەکی تر وەربگرێ, ئەویش ڕەتکردنەوەی تەواوی پەیوەندیە جەستەییەکان بە رادەیەکی تەواو بەجۆرێك کە پیاو هیچ پەیوەندیەك بەجەستەی ژنەوە نەکاتو هەردووکیان بەبێ پەیوەندیە جەستەییەکان بمێننەوە ,دەگمەنە ژن بەمەبەست ئەوە بکات لەکۆمەڵێکی باوکسالاریدا . لەوحاڵەتەدا ژن وەك بووکەشووشەیەکی ساردوسڕی لێدێ کە تەنیا پاڵنەرو ئارەزوەکان لەپیاوەوە بۆ جەستەی ئەو دێت , هەوەها هەر لەهەمان تیۆردا شێوەی سێیەم هەیە کە داوای شۆڕشێکی گەورە دەکات وەك چۆن لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوادا , ڕوودەدات ,( ژنو پیاو تەنیا لەپێناوی منداڵبوون دەگەن بە یەك , هیچ شتێك بۆ ئارەزووەکانی پیاوان نامێنێتەوە . چونکە تا ئێستا تەنیا ڕێگەیەکە بۆمناڵ بوون ), لێرەدا پەیوەندییەکە پشت بەحەز و ئارەزوەکان نابەستێ , بەڵکوپشت بەپێداویستیە مادیەکان, بۆیە سەرنجڕاکێشان لەجەستەی پیاوان



بەگرنگ نازانن,لەتیۆری جەستەیدا ئەم شێوەیە بەکاردانەوەی خراپو توندڕەو دادەنرێت .

بۆچوونی سێیەم(ئاوێتە بوون) لەنێوان هەردوو ڕای پێشوودایە (تیۆری پێداگرتن لەسەر هاوڕێیەتی)یە واتە لە پێشدا هاوڕێیەك دابنرێ وەك هەوڵدانێك بۆ تێکەڵکردنی توخمە دژ بەیەکەکان لەهەردوو ڕای پێشوودا. هەروەك ئەم تیۆرە بایەخ دەدات بە هەستی تەنیایی و دوورە پەرێزی, بۆیە مرۆڤ هەوڵ دەدات واز لەو هەستانە بهێنێ لە میانەی گەڕان بەدوای هاوڕێیەتی و دۆزینەوەی دوانەیی رۆح, یان هاوڕێیەك بۆ ئاویتە بوونی هەردوو جەستە کەواتە ئەم تیۆرە دان بەپێویستی سێکسی دا مەیلی مرۆڤ بۆ گەڕان بەدوای برادەرێك بەهەند وەردەگرێتو گوزارشت لە سەختی هەستکردن بەتەنیایی جەخت دەکاتەوە لەسەر سروشتی ئارەزووی مرۆڤ بۆ هاوبەشێکی لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ململانێکانی ژیاندا, هەتا دوایی لەو جۆرەوەسفانە . ئەمەش یەکسانی لەنێوانداخوازیەکان ژنو پیاودا دەخولقێنێ بۆ پەیمانی بۆ وڕێیەتی لەنێوانیاندا, تاوای لێدێ کە ئارەزووی سێکسیو ئەنجامدانی دەبێتە بەرهەمێکی لۆژیکی بۆ هاوڕێیەتی هاوبەش کە شێوەی کۆتایی دەبێ و یارمەتیدەریش دەبێ بۆ سەرکەوتن بەسەر هەستکردن بەتەنیایی گۆشەگیری چونکە تێکەڵاویو یەکگرتن لەنێوان دواندا ڕوودەدات بۆ ئەوەی یەکێتییەکی تەواو و جوانو هاوسەنگ پێکبێنن.

بیروباوەڕەکانی ئەم تیۆرە لە میانەی تاکڕەوی لەدروستبوونی پەیوەندیەکاندا دەردەکەوێ کە پشت دەبەستێت بەهۆکارەکانی هەستکردن بەتەنیابی لای مرۆڤ دەبەستێت, لێرەوە ژنو پیاو لەپێشکەوتنی خۆیان وەکو یەکێتییەکی تەواوکەری یەکتر بەردەوام دەبن بۆ گەیشتنییان بە لوتکەی کامڵ بوون لە میانەی ناوازەترین هاوڕێیەتی کە یەکتر تەواو دەکات .

ئامانجی ئەم توێژینەوەیە دۆزینەوەی ڕادەی ڕەنگدانەوەی ئەم تێڕوانینانەیە کە بەکورتی لە رۆمان و کورتە چیرۆکانی لە ئەدەبی بەنگلادیشدا,باسمان کردن.

بێگومان لەچوارچێوەی ئەم کتێبە گچکەیەدا ناتوانین لێکۆڵینەوەی دوورودرێژ بۆ هەموو نوسەرو رۆماننوسە گەورەکانی بەنگلادیش بکەین. تەنیا بە گفتوگۆ لەسەر هەڵوێستی هەندێ لەنوسەرە دیارەکان کە لەمەڕ پەیوەندی نێوان ژن‌ودا پیاو دەنوسن, وازدێنین.

ئێمە لێرە ڕای ئەو نوسەرانە هەڵناسەنگێنین, بەڵکو پێ دادەگرین لەسەر ڕەنگدانەوەی ڕایەجۆراوجۆرەکانیان لەنوسینەکاندا, بۆئەوەی لایەنێکی سەرەکی لەفەلسەفەی ژیانی ئەوانبخەینە روو. واتە هەڵوێست‌و بیر و بۆچونیان لەمەڕ سروشتی پەیوەندی لە نێوان ژن‌و پیاو.

ئێستا واباشە لەسەر دوو ڕۆمانی نووسەرێك گفتوو گۆ دەست پێ بکەین بەناوی (ڕەشید کەریم) کە چۆن ئەو لەنوسینەکانیدا تێڕوانینە جەستەییەکان لەپەیوەندی نێوان ژن‌و پیاو,بەبێ ترس دەردەبڕێ. لە ڕۆمانی یەکەمدا کە پاڵەوانەکەی ناوی عیرفانە حەزی دەچێتە جەستەی دوو ژن لە کەسایەتیە ناسراوو گرنگەکاندا ئەگەرچی نوسەر هیچ وێنەیەکی یەککگرتنی جەستەیی لەهیچ بابەتێکی نێو کارەکانیدا پێشکەش ناکات, بەڵام دیارە هەموو کردەوەکانی ئەم پاڵەوانە لەسەر جەستەو سەیرکردنی ئەو ژنەن کە بەهەموو هێزو بونی خۆی سەرنجی ڕاکێشاوە.

نوسەر لەسەر زاری پاڵەوانەکە دەڵێ:

((عائیشە دەبینم کە رۆبێکی لەبەردایەو لەژێریشەوە کراسێك‌و لەناوەوەش ستیانێك...تد ئەوچاوانەی من لێڕاهاتوون کە بەخەیاڵ‌و باسکردن بێننە بینین و شتی وایان نەبینیوە,ئەوەتا دەتوانم لەژێر ئەم هەموو جلەوە ئەوانە ببینم)).



پیاو حەز بەجەستەی ژن دەکات, ئەمە شتێکی سروشتیە, بەڵام ئایا ژنیش دەیەوێ جەستەی پیشانی پیاو بدات؟ ئایا ئەوەی دەوێت؟ ڕەشید کەریم دەتوانێت پاڵنەرەکانی عائیشە بخاتە روو:–

((عائیشە دەخوات‌و هەروەها خواردن پێشکەشی ئەوانی تریش دەکات, لەو کاتەدا شاڵەکە لەسەرشانی دەکەوێتە خوارەوە, ئەو بایەخی پێ نادا, چونکە دەشێ شتێکی لەم شێوەیە ڕووبدات, هەروەها گوێ نادات بەو فشارەی کەئیشوکارەکانی بۆیان دروستکردووە, چونکە تەمەنی گەیشتۆتە 40 ساڵ‌و دوو مناڵی هەیە, کەوابێ ئایا مەرجە لەهەموو کاتێکدا ئەو جل‌و بەرگی بەداپۆشراوی بمێنێتەوە, کاتێ کەجلەکانی پەرش‌و بڵاو دەبێتەوە دەتوانی ئەم جەستەیە ببینیت چێژوەربگرێت ئەوەش هەندێ ڕووداوی خۆشی لێدەکەوێتەوە , ئەمە مانای ئەو وەسفانەیە کە لە قسەکانی نوسەردا هەیە, هەروەك پاڵەوانەکەمان( عیرفان) زۆر بابە وریایێکەوە , دەڵێ:

((روکەشم, باش‌و لەبارە, لەبەردەم باڵاو قەڵافەتم, کاتێ کەقات‌و بۆینباخ لەدوورەوە هەر بەگریگۆری بەگ (هونەرمەندێکی روژئاواییە) دەچم, لەنزیکیشەوە کەبێژامەی باینجانی لەپێدەکەم بەشەهابی بەسواسی(هونەرمەندێکی هیندییە) دەچم, بەڵێ براکەم من لەڕووکەشدا نیوەم بەگریگۆری بەگ‌و نیوەکەی ترم بەشەهابی بەسواسی دەچێ, وەکو پیاوێکیش تۆزێك لەیەکەمیان‌و تۆزەکەی تر لەویتریان دەچم .))

(بێگومان ژنان حەزدەکەن دڵی ئەو پیاوە رازی بکەن کە جارێ لەهونەرمەندێکی رۆژئاواو جارێکی تریش لەهونەرمەندێکی هیندی دەچێ, بۆیە ئاساییە جەستەی خۆیان پیشان بدەن.)

ڕەشید کەریم سوورە لەسەر پەیوەست بوونی بەواقیع, عائیشەی جوان فرمێسکی ناخۆشی هەڵدەڕێژێت کاتێ کەبۆ عیرفان ڕووداوەکانی خۆی دەگێڕێتەوەو باسدەکات کەمێردەکەی پێشئەوەی بیهێنێ لاقەی کردووە , ئەویش ناچارە بەو واقیعە رازی بێت. ناشتوانێ بەپیر داخوازی جەستەیەوە بچێت کە لەگەڵ عیرفانی بێوەمێرد حەزی بەنزیك بونەوەو

یەکگرتووی جەستەیی هەیە لەگەڵیداو گویٚ و بەپلەو پایەی مێردەکەی‌و دواڕۆژی کوڕەکەی نادات, ئەو لەترسی دروستبوونی هەر پەیوەندیەك لەگەڵ عیرفاندا , هەر هەنگاوێك بەدوو دڵیەوە دەنیٚ لەترسی ئەوەی کەنازانیٚ چی روودەدات؟ ئەویش واتە(عیرفان) دان بەواقیعەکەدا دەنیٚ‌و خۆی دەبینیٚ کەناچارە جەستەی عائیشە لەبیربکات, پێویستە بیرکردنەوەی شەهوانی خۆی بەرانبەر بەم جەستەیە دووربخاتەوەو لەوەش سەرکەوتووبوبیٚ.

, عائیشە ئێستا هیچ ڕۆڵێکی گرنگ لەژیانیدا نابینیٚ. بەڵکو ئێستا هیوایەکی تری هەیەو ناشتوانیٚ وازی لێبێنیٚ, بەمەش ((کۆهینەر)) شوێنی عایشە دەگرێتەوە, نوسەر دەڵیٚ:

((پێش ئێستا پەیوەندیەکی هاوڕێیەتیم لەگەڵ کۆهێنەربیبی دروستکرد, دەچومە سەردانی‌و خۆشحاڵ بووم بەوە, هەست دەکەم دەمەویٚ بچم بۆلای, ئەوەش هەستێکی جوانە.))

عیرفان لەکاتی بینینی کۆهینەر جەستەی (زەیبونی) بیردێتەوە کەلەکاتی گەنجێتیدا ناسی بووی. پێدەچیٚ نوسەر لەنەستیی خۆیدا باوەری بە تیۆری ناجەستەیی, کەپێشتر ئاماژەمان بۆی کردبوو, هەبێت, کاتیٚ کەئەو وەسفی کەسێتی کۆهینەر دەکات, بەمشێوەیە قسە لەسەر پێکەنینی کۆهینەر دەکات:

((پێکەنینێکی ئاڵۆز, هەندێجار ئەو پێکەنینەی کەلەچاوەکانیدا بەدی دەکرا, قوڵتربوو لەوەی لەناخی بەرامبەرەکەیدایە. وەك پرشنگ لەژێر خۆرێکی گەرمدا بلاٌودەبوەوە. ئەو پێکەنینەش بەڕووی هەموو پیاوێك لەڕەگەزی مرۆڤایەتیدا. دەردەکەوێت کۆهینەر یاخی دەبیٚ, ئارەزووە سێکسیەکانی پیاوی بۆ دەردەکەویٚ, ئەویش نایەویٚ تەنیا جەستەیەك بێت, لێوەکانی قسەدەکەن, بەلاٌم زمانیشی دیسانەوە لوغزێکە وەکو پێکەنینەکەی, لێرەدا رەشید کەریم جارێکی دیکە باس لە ململانێی ناوەوە دەکات:





لێرەداشتێك هەیە کەچەند لیٚی نزیك بوویتەوە, هەست دەکەی شتێك وون دەکەیت, لەزۆر شەواندا کۆهێنەر هەست دەکات قورسە لەگەڵ مێردە ئیفلیجەکەی بچێتە ناو جێگا, بەلاٌم کەسێك هەست بەئازارەکانی ناکات, بەڵکو لەپاڵیدا رادەکشیٚ‌و بەبیٚ دەنگی نوێنەکە لەباوەش دەگریٚ. هەندیٚ جار سەیری دەرەوەدەکات لەخەیاڵی خۆی وێنەی دەمارەکانی پیاوێکی بەهێزو کامڵ دەکێشیٚ‌و روناکی ئەو مانگە شەوەی رەنگ دەداتەوە وەکو بەرکەوتنی ژنێکی نەرمونیان دەچوێنیٚ, کۆهینەر دان بەهاواری جەستەیی دانانیٚ کەبۆ دابینکردنی پێویستیەکانی وادەکات.

پاڵەوانی ڕۆمانەکە وەکو ئەو ژنە بەهەمان پێویستی لێی نزیك دەبێتەوەو پێشنیاز دەکات ((سبەینیٚ دێیت لەگەڵم؟)) بۆ بەر ڕووبارەکە لەسەر بەلەمێك ببینم....هتد)) عیرفان دەیەویٚ بیبات بۆ سەفەرێك بەنێو ئاوی رووبارداو بەوهیوایە کە لەجەستەی ئەو ژنە نزیك بێتەوە, چونکە هەمان ئومێد دەکات: (هەردوو ئارەزووە حەشاردراوەکەی ناخم بەدەردەخەم یەکەم بەتەنیا دووەم لەناو بەلەمەکەدا.) ئەم هەستە کاتیٚ لەدایك دەبیٚ کە گویٚی لە (نابیٚی) دەبیٚ قسەیەك دەکات! (ژنەکەی ئیحسان گەوهەرە).

بەلاٌم پاڵەوانەکە خۆی ئازایەتی ئەوەندەی نەبوو بچێتەلای بەلەمەکە, چونکە هێشتا ترسی لەغەریزەی خۆی هەبوو بەرامبەر کۆهینەر چونکە لەوە ڕزگاری نەببوو. ئەو جیایە, چونکە کچێکی ئاسان نیە, (رێگەی پێنادا دەستی لیٚ نزیك بکاتەوە), گومانی لەوە هەیە بەهۆی چاوەکانی کۆهینەرو پێکەنینە گاڵتە جاڕەکەی کەئارەزووی حەشاردراوی پیاوێك وەکو گەرمی سوتێنەری خۆر پەرش‌و بلاٌودەکاتەوە, ئەو ئافرەتە دەچێتەلای‌و مێردی بەجیٚ دەهێڵیٚ بەلاٌم تێربوون لە پێداویستیە رۆحیەکان هەموو شتێك نییە, بۆیە دەگەڕێتەوە لای مێردە ئیفلیجەکەی کە لەگەڵیدا بەدرێژایی ڕۆژگار هەستی بەنزیك بونەوەکردووەو لەو پەیوەندیەی ڕۆژانە لەنێوانیاندا هەبووە هەست‌و سۆزی لادروست کردووە.

ئەگەرچی منداڵی نەبووە بەڵام ڕەنگە غەریزەی دایکایەتی پاڵی پێوە نابێ بۆ پارێزگاری کردنی ئەو پیاوە, هەربۆیە زەردەخەنە گاڵتە ئامێزەکەی لێوانی بۆ دەگەڕێتەوە.

نوسەر لەم ڕۆمانەدا ئاماژە بەناکۆکی نێوان دوو تیۆر دەدات لەبارەی پەیوەندی نێوان ژن‌و پیاودا. لەمیانەی ئەم دوو کەسێتییە سەرەکیەی ڕۆمانەکەدا, نوسەر وەکو تێبینی دەکەین لەنێوان ڕەوشتی‌و ئاکاری عائیشەو کۆهینەردا لەتیۆرەکاندا دوو دڵە , بەڵام مەیلی بۆ تیۆری جەستەیی دەچێ, لەمیانەی کارە دانسقەکانیدا پێمان دەگەیەنێ کەچارەیەکی تەواو ڕەها بۆ پەیوەندی ئاڵۆزکاوی نێوان ژن‌و پیاودا نیە.

تیۆری جەستەیی بەهێزترو ڕوونتر دەردەکەوێ لەڕۆمانی (خۆشەویستی گوڵی سووردا), چیرۆکەکە باس لەپەیوەندیەکی سیانی (سێگۆشەیی) خۆشەویستی دەکات کەلەهێڵێکی ڕاست لەپاش توانەوەی سێگۆشە کەتەواو دەبێ, کەسە سەرەکیەکان (عومەر, ڕانوی ژنی, سەفا- بەڕێوەبەرەکەی) ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە لەنێوان ئەم سێ کەسە سەرەکیەدایە. هەردوو کەسایەتیە پیاوەکە بەچاوێك لەژنەکە دەڕوانن کەئامرازێکە بۆ ڕازیکردنی ئارەزووەکانی پیاو, دروست بووە, ئەمە لەوپەڕی ئاشکراییدایە کاتێ کەعومەر گوزارشت لەبیرکردنەوەکانی دەکات, پێدەچێ کەسێتی سەفا لەڕۆمانەکە بۆ ئەوە دانرابێ کەروخسارو شێوەیەکی تر بدات بەڕۆمانەکە, چونکە ئەو ڕۆڵێکی کاریگەر نابینێ بەڵکو لەپشت پەردەوەیە, بەڵام عومەر لەناوجەرگەی روداوەکاندایە, تێبینی ڕەوشتی ژنەکەی دەکات‌و هەڵدەچێ‌و توڕەدەبێ. عومەر زۆر بایەخ بە ژنەکەی دەداو بایەخ بەژنانی تر نادات, بەڵام ئەتواری سەیرەو حەزی بەتەماشاکردنێکی ئاشکرا هەیە, ڕانوش وەڵامدانەوەیەکی بۆ ئارەزووە پەنهانیەکانی مێردی هەیەو فرسەتی لەو لاوازیەی مێردەکەی وەرگرتووەو قۆزتویەتیەوە .

((عومەر چۆنی بوێت ئەبێ ڕانوو بەوشێوەیە جەستەی خۆی ڕووت بکاتەوە, نایەوێ بەجلی رەسمی ببیبینێ‌و لەبەری بکات بەتایبەتیش



کاتێ خۆی لەئیش دێتەوە بۆماڵەوە بۆیە رانو ناچاربووە کراسی بەکراوەیی بەجێ بهێڵێ لەسەر داوای عومەر, بەڵام ڕێگەی پێنادات لەدەرەوە لەبەری بکات, زۆری تریش لەو قسانە....تد)) ڕانوو لەسەرەتادا زۆر شەرم دایدەگرت لەو ڕەوشتەی مێردەکەی, لەپێشدا ناڕەزامەند بوو, بەڵام ئێستا ئەو هەلە لاوازەی ئەو دەقۆزێتەوە, چونکە بەهەرحاڵ ئەو مێردیەتی‌و دەبێ ئەوەی دەیەوێ, وابکات, تێروتەسەلی پەیوەندیە جەستەییەکەی نێوان هەردوو ژن‌و پیاوەکان کۆنتڕۆڵی ڕۆمانەکەی کردووە, سەفا جار ناجارێك وەکو هاندەرێك لەو کردارەدا دەردەکەوێ. کەهەندێ جار ڕوونیەکە لێڵ دەکات واتە کار لەو ژیانی هاوسەرێتییەی کەبێ گرفتە دەکات, ڕانوو لە دڵە ڕاوکێدایەو چارەشی نیە دەبێ بەدیبلۆماسیەت مامەڵە لەگەڵ بەڕێوەبەر (سەفا)بکات, ئیشەکەی عومەر بۆ ژیانیان گرنگیەکی زۆری هەیە, بۆیە ناچارە هەندێ لەدیاریەکانی سەفا وەربگرێ‌و هەندێ جاریش ئارەزووەکانی جێبەجێ بکات, ڕازی نیە خۆی ببەخشێ, بەڵام دەهێڵێ بەدزیەوە چاو لەو جەستە جوانەی ببڕێت, ئەمە ڕاست نیە, بەڵام چارەیەکی گونجاوەو هەموولایەك ڕازی دەکات. بەمشێوەیە وەڵامی پرسیاری عومەر دەداتەوە:

((عومەر, من هەمیشە بەدڵسۆزیەوە وەڵامی هەموو پرسیارێکی تۆم داوەتەوە, ئاخۆ باوەڕم پێدەکەیت ئەگەر ئەوە بڵێم کەناتوانم بەبێ تۆ بژیم؟)). لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی وایە ئەوچاکە یە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە, کە عومەر ئێستا لە کارەکەیدا مووچەی بۆزیاد بووە.

عومەر دەڵێ: (من هەمووشتێك دەزانم).

ڕەشید کەریم لەوکاتەدا پەرۆشیی ژنەکە دەردەبڕێ بۆ ئەو خۆ دەرخستنەی خۆی بۆ سەرنج راکێشانی ئەو پیاوەی کەحەزی لێدەکات.

ڕانوو لەعومەری پرسی, چی دەبینیت؟

بە بزەیەك ئەو پرسیارەی کرد کەلەچاوەکانی‌و دەمیەوە دەردەکەوێت کاتێ کەدەیەوێ‌و هەوڵدەدات بەزۆرترین ڕادە خۆی قەشەنگ دەربخات, ئەو پێشتر لەشتی لەم شێوەی نەپرسی بۆوە, ڕەنگە ئەوە بەگومانێك

لەتوانای ئەوبۆ سەرنج ڕاکێشان بزانرێ، ئەو هەمیشە ڕەواجی هەبووەو هەرگیز هیچ شتێکی کەسی نەویستوە. بێجگە لەوەش ئەگەر ئەو حەزی بەشتێك کرد، وەکو وروژاندنی مێردەکەی بەلای خۆیداو جوڵەی جەستەی نەرمو نیانی، وادەریناخات کەئەو خۆی ئارەزوومەندە.

بەم شێوەیە ڕۆمانەکە لەسەر ڕێتمی چ شتێك ووروژێنەرە بۆ نزیك بونەوەی نێوان ژنو پیاو، دەڕوات، پێدەچێ پەیوەندی نێوان عومەرو ڕانوو بەهێز بێت ، بۆیە زاڵ بوون بەسەر ئەو کێشەیەی کە سەفا لەنێوانیانی دروستکردبوو، چونکە ئارەزووکردنی عومەر بەهێزەو تێرکردنی ئەم ئارەزووکردنەش بەهێزترە.

دواجار لەکۆتایی ڕۆمانەکەدا سەفا پارەیەکی کاغەز دەردێنێ و دەیداتە عەبدول و داوای لێدەکات تەزووی کارەبای سەرەکی بپچڕێنێ بۆ ئەوەی ئەو تاریکیە ببێتە هەلێك بۆ ئەوەی هەست بەجەستەی ڕانوو بکات، بۆیە هەلەکەی بۆ دەچێتە سەرو، لەولاوە ڕانوش لەوتاریکیەدا وادەزانێ مێردەکەیەتی بۆیە دەڵێت: ((عومەر تورەیت؟))

گوێی لەکەس نابێ وەڵام بداتەوە، کاتێ بەکتەو پڕ دوو دەست دەگەنە سنگی ڕانوو و دوو لێوی تینووش لەسەر لێوەکانی دەنیشن، کاتێك دوو دەستی نامۆ دەستی لێ دەدەن درك بەهەڵەکەی خۆی دەکات و عەقڵی لەدەست دەدات بەڵام هەستێکی جوانە، لەگەڵ ئەوەی کە عەقڵ ڕەتی دەکاتەوە بۆ چرکەیەکیش بێت تەسلیمی حەزی لێوەکانی دەبێ، ئەوە لە خولەکێك زیاتر ناخایەنێ، دوایی بەتوندی بەپێیەکانی پیایدا دەکێشێ و پیاوەکە لەخۆی دوور دەخاتەوە.

سەرنج ڕاکێشانی جەستەیی لەنێوان ژنو پیاودا شتێکی سروشتیە، بەڵام لێرەدا داب و نەریتی کۆمەڵایەتی وامان لێدەکات کەلەهەندێ لەهەڵوێستەکانی ژیانی ڕۆژانەدا ئاگاداربین، ڕێگەی دیاریکراو بۆ ڕانوو ئەوەیە کە ببێتە هاوسەرێکی دڵسۆزی عومەر چونکە خۆشەویستی لەژیانیاندا وەکو گوڵێکی سوور وایە لەو پەیوەندیە نزیکەی نێوانیاندا دروست بووە و والەژیانیان دەکات بەڕێچکەیەکی دیاریکراودا بڕوات،



بوونی سەفا ناتوانێت ڕێچکەی ژیانیان بگۆڕێت لەگەڵ ئەوەی کە هەندێ گرفتیش دروست دەکات .

ئەو پەیوەندیە جەستەیەی کە کۆیان دەکاتەوە بەهێزترە کەبگاتە ڕادەی جیابوونەوە، ئەمەش گوزارشت لەوە دەکات کە نوسەر ڕەشید کەریم باوەشی خۆی کردۆتەوە بۆ ئەو دیدگا جەستەییەی پەیوەندی نێوان ژنو پیاودا، تاکە بونیادی پەیوەندی سەرنج ڕاکێشانی جەستەیی نێوان هەردوولاو جێبەجێکردنی ئەو ئارەزوەیە.

با ئێستا بچینە لای تێڕوانینی دووەم. لەئەدەبی بەنگلادیشدا ئەوەندی ئێمە زانیاریمان هەیە لەبارەیەوە گفتوگۆ لەمەڕ تێڕوانینی ناجەستەیی بەتایبەت لەدوو وێنەی یەکەمدا نەکراوە، بەواتایەکی تر، ئێمە سەرەتای رایەکی دیکەمان نەبینیوە کەبەشێوەیەکی تەواو پەیوەندی جەستەیی نێوان ژنو پیاو ڕەتبکاتەوەو دروستبوونی پەیوەندی لەگەڵکەسێکی نزیکی (مەحروف) خۆی داوابکات .

پەیوەندی نێوان دایكو کوڕ، نێوان باوكو کچ یا نێوان خوشكو برا ناچێتە چوارچێوەی پەیوەندیە جەستەییەکان، ئەوەی کەلێرەدا دەمانەوێ باسی لێوە بکەین، ئەوەش مانای ئەوە نیە کەئێمە لەگرنگی ئەوە کەم دەکەینەوە بەڵام ئەمانە پەیوەندی خۆیینو هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتی بەهێزمان هەیە نایەڵێ قسە لەچوارچێوەی جەستەیی ئەم بابەتە بکەین ئەویش لەبەرئەوەی تابۆکانن.

فرۆید قسە لەسەر (گرێ دەرونییەکان) دەکات لەتیۆرەکانی شیکردنەوەی دەروونیو جەخت لەتوخمە سێکسیەکانی ئەم پەیوەندیانە دەکاتەوە ، کتێبەکە ئاگاداری کارەکانی فرۆیدە، بەڵام کاریگەری لەسەر ڕۆمانەکانمانو کورتە چیرۆکەکان تێبینی نەکراوبووە. لێرەدا ئامانجمان ئەوە نیە هۆکاری ئەم دیاردەیە دیاری بکەینو هەروەك ئێمە لێرە قسە لەسەر ئەو پەیوەندیە ناباوە ناکەین، چونکە ئەو تابۆ کۆمەڵایەتیانە بەهەند وەردەگرینو لێرەدا بەم شیکردنەوە سادەیە بۆ ئەمجۆرە

پەیوەندیانە وازدەهێنین‌و (هەروەك بۆ ئەوەی نووسەر شەرم نەیگرێ دوورکەوتۆتەوە لەباسکردنی ئەم مەسەلەیە).

(حەسەن عەزیز ئەلحەق) لەکورتە چیرۆکەکانیدا وێنای هەندێ کەسایەتی ژنانی کردووە کە شێوەی سێیەم لەتیۆری ناجەستەیی بەرجەستە دەکات,لێرەدا پێویست بەباسکردنێکی زۆری ئەو چیرۆکانە ناکات, بەڵام نوسەر بەئاشکرا باسی شۆڕشی ژنان لەمەڕ پەیوەندی بنیادنراو لەسەر کرداری سێکسی لەگەڵ پیاودا دەکات, چیرۆکی (سەرال هینگشا)ی نوسی کەلەنێو کۆمەڵە چیرۆکێك بەناونیشانی (لەنەخۆشخانەو جیهانی خوارەوەدا) بوو, تیایدا شێوازو زمانێکی جیای بەکارهێناوە وەکو گوزارشتێك بۆ شۆڕشی ژنان.

پاڵەوانی چیرۆکەکە کەبەهەر جۆرێك بێ ئەزموونی بێبەختی ژیانی خۆی لەگەڵ پیاوێك تێپەڕاندووە کەدەموچاو مڕومۆچ, ئێسك پان, ئارەقەی بۆنی ناخۆشی لێهاتووە, وەکو ئەوەی لەسەر رۆخی مردندا بێ, ژنە لەژیانیشدا ئەمجۆرە هەستەی کردووەو دڵی هەمیشە بەپەلە لێیداوە, لەناخیشەوە بورکانێکی پڕ لەئاگرلەگەڵیدا ژیاوە, ئەگەرچی ئەو لەژیانی خۆیدا هەستی بەپیاوێکی بەمجۆرە کردووە, بەڵام ئێستا ئەو مێردەی لەبیر نەماوە. هەر بیریشی لێ ناکاتەوە. پاش کەمێك دوای ئەوە ئەبینین بڵێسەی یاخی بوون لەچاوەکانی ئەم ژنەدا دەرئەکەوێ, کاتێ کە پیاوێکی کورتەباڵا لەبەردەمیدا ئەبینێ‌و دەستی لەگیرفانەکانی دەردەهێنێ‌و کۆمەڵێك پارە هەڵدەڕژێتە پێش ژنەکەو لەبەرانبەر ئەوەشدا نزیك دەکەوێتەوە لێ‌ی‌و دەستی دەگەیەنێتە شان و باڵو سنگی هتد , ژنەکەش وەکو تیر دەچەمێتەوەو دەنگی لەپشیلەیەکی تورە دەچێ و بریسکەی چاوەکانی وەك بەرد ڕەق دەنوێنێ هەناسەکانی وەك بڵێ‌ی تێکەڵ بەژەهرێکی تاڵ دەبێ‌و هاوار دەکات ((دوورکەوە لێم, نزیك نەکەویەوە, دوورکەوە لێم)). ژنەکە بەمشێوەیە دووردەکەوێتەوە, پیاوە کورتەباڵاکەش بەدوایدا ڕادەکات وەك ئەوەی خۆی بۆ قوربانیەکی ژێردەستی ئامادەکردبێ, بەهەموو توانای خۆیەوە هەوڵ دەدات ژنەکە



بگرێت, بەڵام هەوڵەکەی پوچەڵ دەبێتەوە. لەولاشەوە هەندێ لەژنانی تر دەردەکەون.

نوسەر (حەسەن عەزیز ئەلحەق) دەنوسێت:

ژنەکان لەو کورتە باڵا پیاوە دەڕوانن‌و هەریەکەیان قسەیەك دەکات:

* گولاپی: بۆچی خاوەنەکە قسەیەك ناکات؟

* تیپ: بۆچی پیاوە هندۆسەکە وشەیەك نادرکێنێ؟

* جایتون: پێدەچێ خاوەنەکەی ناتوانێ کارێکی چاك بکات ؟

* تیسیرون: پیاوە هندۆسەکە بەزەییەکت بەئێمە نایەتەوە؟

لەهەموو لایەکەوە ژنەکان پێکەنینیان وەکو گەردەلولێك هەڵدەکاو کورتەباڵاکە بەولاو ئەوم لادا دەخەن. لەم کورتە چیرۆکەدا کورتە باڵاکە وەکو سمبولێکی ڕەگەزی نێرینە خۆی دەنوێنێ, کاتێ کەدەبینێ هێزی ژنەکە تەقیوەتەوە, ئەو دەبێتە پیاوێکی بێ هۆش, ژنەکەش کەلەڕووی پیاوەکە وەستاوە تۆڵەی هەموو ئەو ئازارانەی رابردووی خۆی لێدەکاتەوە, ئەمەش ئەو دادپەروەریەیە کە پێویستە رۆژێك بێتەدی.

چیرۆکی (خنان) واتە (چاڵ) لەو کۆمەڵە چیرۆکەیە کەلەسەر هەمان بابەت دەوەستێ, ڕۆژنامەوانێکی مەیدانی دەچێتە گوندێك بۆ سەیرکردنی هەڵکەندنی چاڵی گەورە گەورە, بۆ ئەوەی راپۆرتە هەواڵێکی لەسەر ئامادە بکات, لەوکاتەدا بۆ ڕایی کردن‌و تەواوبوونی هەندێ لەژنانی دەستگێڕ بۆ سەر کارەکە دێنن. لەوێدا لاوە رۆژنامەوانەکە چاوی دەکەوێتە سەر جەستەی ژنەکان, بەتایبەتیش ئەو ژنانەی کە گەنجن, لەژێر جل‌و بەرگیانەوە سەیری جەستەیان دەکات.

پیاوەکە هەوڵدەدات کۆنترۆڵی خۆی بکات‌و چاوی دوربخاتەوە لێیان, بەڵام هیچ خۆشیەك نابینێ, لەبەرئەوە بەدرێژایی کاتەکە چاوەکانی رۆژنامەوانەکە دەگەڕێتەوە سەر جەستەی ژنەکان ئەمە دیارە غەریزەیەکە, بەڵام کاتێك ژنێکیان بەلایدا تێپەڕدەبێ, لەترساندا گرمۆڵە دەکات.

دوایی دەبینین رۆژنامەوانەکە زیاتر دەترسێت کاتێ کە دەبینێ ژنە لاوەکە لەبەردەم دەرگاکەیدا وەستاوە, ووشەکانی حەسەن عەزیزی نوسەر

بەشەفافیەت نوسراوەو وەکو پێکەنینێك کەلەسنگی ژنەکە دێتە دەرەوە, بڵاودەبێتەوە:–

((ئەم کچە لاوە هات, ئێستا لەبەردەم دەرگاکە وەستاوەو دەستیشی لەسەر دەرگاکەدایەو مەمکەکانیشی وادیارن کە خەریکە هەر ڕووت ببنەوە, وەکو دەبینین کچەلاوەکە دەست پێشخەریەك دەکا بەشێوەی بزەیەکی جوان کەلەسەر لێوەکانیدایە, بزەو خەندەیەك کەوەکو نیگاکانی ڕاستەوخۆو ئازان وەکو خۆی.))

ڕۆژنامەوانەکە وەکو ئاژەڵێکی بریندار هاواری لێ هەڵدەستێ:

((دووریخەنەوە, یەکێ دووریخاتەوە لێم.))

پێدەچێ ئەم گەنجە لەڕەمزی پیاوەتی خۆی بترسێ بەرانبەر بەو هێزە پەنهانیەی کەلەناخی ژنەکەدایەو بەمشێوەیەش ژنەکە گوزارشتی لێدەکات.

هەروەك ئەم هەستکردن بەیاخی بوونە لەلای نوسەرێکی تری وەکو (سەید وەلی ئەڵڵا) دەبینرێ لەو کەسایەتیە ژنانەی کەلەنێو ڕۆمانو چیرۆکەکانیدا پاڵەوانن, ئەو زیاتر بەشێوازی ناڕاستەوخۆو پەنهان باسیکردووە. پاڵەوانی ڕۆمانی (شاندر ئەمباشایا) واتا (مانگی وون بوو) گوزارشت لەجەستەیەکی مردووی ژنێك دەکات, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زەنگی یاخی بوون, بەشێوەیەکی ئاڵۆزو پەنهان بەدرێژایی کات لەو لاشە مردووە دەبیسترێ:

پاڵەوانی ڕۆمانەکە مامۆستایەکی گەنجەو ناتوانێ هیچ ئاسەوارێك ببینێ:

((ئاژەڵێکی دڕندەیە, نەخشۆکەو نەمشکی نێو کێڵگە, سێبەرو رووناکی لەدەستەی بامبۆ یاری دەکەن, لەنێوەڕاستی سێبەرو ڕوناکیەکەدا لاشەی ژنێکی گەنج ڕاکشاوە, نیوەی ڕووت بووەیە, تیشکی مانگەکە بەتەنیشت پێیەکانیەوەیەتی, ئەم گوزارشتە سمبولی یاخی بوونی لاشەی ژنەکەیە, کەچۆن دڵی مامۆستاکەی گرتووە, ئاوا دڵی خوێنەرانیش دەگرێ, ئایا ئەوە تەنیا گوزارەیەکە لەجوانی تیشکی





مانگەکە؟ ئەمە پەیوەستە بەلاشەی ژنە لاوەکە, بەڵام ئایا ئەمە هەموو شتەکەیە؟

ژنە لاوەکە ناتوانێ بەهاوار گلەییەکانی دەرخات, ئەم دیمەنە تەنیا سمبولێك نیە, بەڵکو تیشکەکان بەپەنهان ناڕەزایی خۆیان بۆ ئەو زوڵمەی کەتووشی ئەم کچەلاوە هاتووە, دەردەبڕن.

بۆچی دەروێش قادر لاشەی ئەم ژنەی بۆ دوور بردو دواتر فڕیێی دایە نێو ڕوبارەکەوە؟ وەلی ئەڵڵا لەڕێگەی (پاڵەوانە مامۆستاکە)یەوە لەوەڵامی ئەم نهێنیە دەگەڕێ و بیر دەکاتەوە!

قادر بڕیار دەدات لاشەکە بشارێتەوە, بۆچی؟ ڕەنگە هەست بکات کەوا باشترە بەتەواوی ون ببێ و کەسیش نەیدۆزێتەوە , ئایا قادر بیری لەسزای ئەو کەسە نەدەکردەوە کە کوشتویەتی؟ ئەو بەشاردنەوەی لاشەکە تاوانی کوشتنی دەشاردەوە, ڕەنگە بەخت یاوەری ئەم ژنە نەبووبێ بۆ ئەوەی تامی خۆشی و ڕەفاهیەت و سۆزو خۆشەویستی و ڕێزبکات, لەسەرووی ئەمەشەوە بۆچی ئەو ژنە بەمشێوە ناخۆشە بکوژرێ؟ لێرەدا سێبەرێك لەیاخی بوونی ئەم بیرکردنەوانە هەیە, مەسەلەی دادپەروەری سروشتی لەنێویدا زۆر باسکراوە, بۆیە دەروێش قادر لەگەڵ ئەوەی کە بکوژە, بەڵام دەتوانێ لەژێر سزادانی ئەم تاوانە دەربچێت؟ وەڵامەکەش بەم شێوەیە دەبێ:

دەروێش قادر کوڕێکی بەنازەو لەخێزانێکی بەهێزو دەسەڵاتدا دەژی کە هەمووشتێك لەپێناوی هەوەس و ئارەزوویاندایە, بۆیەش کۆتایی چیرۆکەکە وادەبینین کە مامۆستاکەی لای لاشەی ژنەکە لەبری ئەو تاوانەی کە قادر کردویەتی سزا دەدرێت.

لێرەوە جارێکی تر مەسەلەی دادپەروەری دێتەوە گۆڕێ, بۆیە نوسەر دەڵێ:–

کێ سزا دەدرێ؟ ئەمە چیتر گرنگ نیە, چونکە کار لەژیانی ژنە مردووەکە ناکات ئایا گرنگە کێ سزا بدرێ؟ سزادان چیتر لەبەر ژەوەندی ئەو ژنەدا نیە!...

ئەگەر مامۆستای پاڵەوانەکە بەدەستی خۆی سزا بۆ هەڵەکەی خۆی بێنێ و ئەو سزا بدرێ لەبەرئەوەی ژنە مردووەکە توشی ئەو زیانە هاتووە, کەوابێ کێ مەبەستە سزای بەرکەوێ؟.

رۆمانی ((بگری, رووبارەکە بگری)) لەسەر هەمان ئاواز دەژەنێ, خەدیجەی ژنی محەمەد مستەفا خۆی دەکوژێت, خۆی دەخاتە نێو گۆمێکی گچکەی پیس و قێزەون دواتر محەمەد کە هەواڵەکەی پێ ڕادەگەیەنن لە

(کۆمردانجا) دەگەڕێتەوە , مامۆژنی (خەسووی) کاتێ کەڕووەکی تەنبولی بۆ دێنێ پێی ڕادەگەیەنێ کەئەو خەتابارە لەخۆکوشتنی خەدیجەدا, کەواتە پرسیار لێرەدا ئەوەیە: بۆچی بەهۆی ئەوەوە خۆی دەکوژێت؟

بۆچی بەرەوپیری ئەو کارە ڕۆیشت؟

وەلی ئەڵڵا دەڵێ: کێ دەزانێ خەدیجە چۆن مرد، گەیشتنی هەواڵی ژن مارەکردنی مستەفای مێردی خۆکوشتنەکە ڕوویدا, بۆیە ئەو پیاوە هاتە مێشکی کە ئەم هەواڵەی ئەو بۆی نوسیبوو هۆکاری خۆکوشتنی ژنەکەبووە, مستەفا بۆی نوسیبوو:

(دانوساندن لەبارەی هێنانی ژنی سێیەمی کە کچی (ئەشرەف حوسێن شودهوری)ی کۆتایی هاتووە, ئەم کابرایەش فەرمانبەرێکی حوکومی بەرزبوەو بەم دواییە گەیشتۆتە تەمەنی خانەنشین) محەمەد نەیدەزانی چۆن باوەڕ بەوە بکات, دوایی بڕیار دەدات ژن هێنانەکە دوا بخات بەهۆی ئەم کارەساتەی کەڕویداوە, (ئەمە کەمترین شتە کە پێویستە بیکات) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئارامی نابێ و وەکو جاران ناتوانێ بخەوێ و بحەوێتەوە, دڵەڕاوکێکەی ئازاری دەدات بەوشێوەو ڕادەیەی کەبەرگەی ئەم ئازارە ناگرێ, بۆیەش لەبەیانیەکی زوودا, جەستەی بێ گیانی محەمەد مستەفا لەژێر سێبەری دارێکی تەمەرهندیدا دەدۆزنەوە, ئەو دارەی کە شایەتی بۆ هێڵی ژیانی ئەو پیاوە لەقۆناغی منداڵی و لاوێتیدا, دەدات, چاوەکانی



کراوە کوێرن چونکە بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن لەنێو قێزەونی و پیسی گۆمەکەدا, کەدیارە ئەو کەسەش خەدیجەیە.

لێرەدا سروشت خۆی دادپەروەریەکی بەدەستهێنا, خەدیجە مردو مستەفاش بەرگەی ئەو ژیانەی نەگرت, دوای ئەوەی کەبوەهۆی ناخۆشی و کولەمەرگی بۆی, بۆیە رووبارەکە لەو ریوایەتەدا بەردەوام دەگری, نەك بۆ خۆی بەڵکو بۆ چارە ڕەشی و لەپێناو ئازارەکانی خەدیجەو ئامینە بیجوم و ژیانی هەموو خەڵکی کۆمردانجا.

با ئێستا بچینە سەر تێڕوانینی سێیەم, کەئەویش ئاوێتەیەکە لەهەردوو تیۆری جیای کەپێشتر باسمان کردوون. لێرەدا لایەنی جەستەیی لەپەیوەندی نێوان ژن و پیاو قەبوڵ کراوە, بەڵام لێرە توخمی هاوڕێیەتی زێدە دەکرێت, بۆیە لەم روئیایەدا پەیوەندیان تەنیا لەلایەنە جەستەییەکەوە کورت ناکرێتەوە, بەڵکو ژن و پیاو هەردوکیان وەکو دوو تاکی ژێر کاریگەری هەستکردن بە تەنیایی و دوورە پەرێزی بەدوای یەکتردا دەگەڕێن, بۆیە هاوڕێیەتی لەکاتی بەدەست هێنانی هاوبەشێکی گونجاو سەرهەڵدەداو دەگاتە لوتکە لەکاتی یەکگرتنی جەستەیی, لەچیرۆکەکانی شەوکەتدا ئەمجۆرە ڕێچکەیە بەئاشکرا دەبینین, لەمەوە دایەلۆگ بۆ دوو چیرۆکی ئەو دەکەین ئەوانیش.. یەکەمیان (کۆچکردن) دووەمیان (چیرۆکی خۆشەویستی)ن.

چیرۆکی کۆچکردن ڕووداوەکانی لەبارەی پێشڤەچوونی پەیوەندیو خۆشەویستی نێوان کچێك و کوڕێکدایەو چیرۆکەکەی تریش وەسفی هاوڕێیەتی نێوان پیاووژنێك دەکات کە لەناوەڕاستی تەمەندان.

نوسەر بۆ پارێزگاریکردن لەلایەنی بابەتی لەبەیەکگەیشتنی جەستەیی هەردوو چیرۆکەکە دوور کەوتۆتەوە, چونکە ئەو وای دەبینێ کە هاوسۆزی ڕوحی لە سەرنج ڕاکێشانی جەستەیی و سێکسی گرنگترە. بەڵام ئەو چیرۆکانەی هەرگیز ململانێی ئەفلاتونیان تێدانیە. بیرکردنەوەی مێشکی ئەو پاڵەوانە کچ و کوڕانە هەڵقولاوی هەستکردن بەسەرنج راکێشان دەخولێتەوە, نکوڵی لەبوونی پێویستیە خۆرسکیەکان بەرانبەر

بەیەکتری دەکەن, بەڵام ئەمە بوونیان پێ سەرقاڵ ناکات, جەستە بوونی هەیەو هەر دەشمێنێتەوە, ئەگەر هەڵێك بۆ پێشکەوتنی پەیوەندیەکە هەبێ بۆ پلەیەکی زیاتر نزیك بونەوەی جەستەیی لە کاتێکی گونجاودا. کەواتە هەموو توانایەکی پێویست بۆ بەئەنجام گەیشتن دەخەنە گەڕ, بەڵام ئەم پەیوەندیانە تەنیا پشت بەسەرنج ڕاکێشانی جەستەیی نابەستێت, ئەوکچ‌وکوڕە بەحوکمی سروشتی کەسایەتی خۆیان‌و پێکهاتەی زەینیان لەیەکتری نزیك دەبنەوە, بەوەش کێشکردنی زەیینی‌و گونجان لە نێوانیان دروست دەبێ‌و هەریەکێك لەوان دەرك بەسنووری ئەویتریان دەکات. ئەمە هۆکاری تاکڕەوی ئەم پەیوەندیانەیە, وەکو هاوڕێیەك نزیك بوونەوەو هەروامانەوە هەتا ئەگەر نەشتوانن زیاتر نزیك ببنەوە.

باکگراوندی چیرۆکی (کۆچکردن) لەکاتی شەڕی ئازادکردنی ڕۆژهەڵاتی پاکستاندایە لە مارسی ساڵی 1971دا. لەیلا کە کچەکەیە لەگەڵ حەسەن لەکاتی هەڵاتنی خەڵك لە (دەکا)وە بۆ لایەکەی تری رووبارەکە کە (بورجنجا)یە ئەو کچ‌و کوڕە لە نێوەڕاستی قەرەباڵغی خەڵکەکەدا هەست بەکێش کردنی یەکتری دەکەن, حەسەن بەهۆی برینداربوونی ناتوانێ بەردەوام بێ لەڕۆیشتن, دەبێ چارەسەری پێی بۆ بکەن, بەخت وای بۆ دێنێ کە پزیشکێکی بەتەمەن لەلادێکەی کەلێی حەشاردراوە, دەبێ, دکتۆرەکە سەیرێکی قاچی برینداری حەسەن دەکات‌و دەست بەچارەکردنی دەکات, لەیلاش لەخەمی خۆیدایەو دەستی دکتۆرەکە دەگرێ, ئەوە مەحاڵە ئەو بگەڕێتەوە بۆ (دەکا) بۆیە ئەوەی پێویستە بکرێ, دەبێ ئەنجام بدرێ, ئەویش, نەشتەرگەری حەسەن‌و لەدەستدانی قاچیەتی, دکتۆرەکە نەشتەرگەریەکە, ئەنجام دەدات, لەیلاش دوای تەواوبوونی ئەوە لەمینای پەنجەرەکەوە دادەنیشێ‌و هەست بەبۆشاییەکی گەورەدەکات, لەبەر ئەوەی حەسەن یەك لەقاچەکانی لەدەست داوە, ئەوەش نغرۆی ئازارێکی ناخۆشی دەکات, ئەم هاوسۆزیە هەستێکی هاوڕێیەتی لەنێوان ژن‌و پیاوەکەدا دروست دەکات, دوایش خۆشەویستییەك دێتە ئاراوە.



حەسەن بەلەیلا دەڵێ: (ئێستا هاوڕێین) لەیلا لەبێدەنگیەکدا گوێی لێگرتووەو ئەویش بەچرپە قسەیەك دەکات وەکو ئەوەی خۆی بدوێنێ (ئایا ئێمە تەنیا هاوڕێین؟) بەڵام پێناچێت ئەوان تەنیا هاوڕێبن, لەیلا دەتوانێ لەگەڵ ئەوانی تر ڕابکات‌و حەسەن بەم حاڵەتە بەتەنیا جێبهێڵێ. ((لەیلا هەوڵدەدات حەسەنی پەککەوتوو هەڵبسێنێتەوەو بەخۆیەوە دەیگرێ‌و سەری لەسنگی نزیك دەکاتەوە بەڵام ئەم هەوڵەی سەرناگرێت.))

حەسەن تکا لە لەیلا دەکات بڕوات‌و بچێتە ئەو شوێنەی کە ئارام‌و ئاسایشە . لەکۆتایی چیرۆکەکەشدا بەتەنیشت یەکتریەوە دادەنیشن‌و هەردوو هاوڕێکە چاویان دەبڕنە ئەو داهاتووەی کەئومێدیانەو لەو ئاوات‌و ئارەزووەو ترس‌و نیگەرانیانەی کە هەیانە, یەکدەگرن.

ڕەنگە ئەوەی سروشتی‌و ئاسایی بێت لەپەیوەندیەکەیاندا ڕوویدات, ڕەنگە نەء. ئەوان هەست بەنائارامی‌و دڵەڕاوکێ ناکەن, بەڵکو ئەوان یەکگرتوون, لەگەڵ ئەوەی کە یەکگرتنی جەستەیی لەنێوانیاندا بوونی نییە, ئەگەرچی هەستیشی پێدەکەن بەڵام ئەمە نابێتە ڕێگر لەو یەکیەتیەی لەروحیاندایە.

(چیرۆکی خۆشەویستی) کە دووەمیانە لەساڵی 1986 لەکتێبی (purbani) کەلەزنجیرەی جەژندا بڵاوبوەوە سەریهەڵدا, کە ئەویش بەم شێوەیە:

(نیرۆ دێتەوە بۆ (شیتا) دوای ئەوەی کە کوڕەکەی لەکۆلیژی ڕەجشاهی سەربازی وەرئەگیرێت, ئەو ژنە بەشەمەندەفەری ناوخۆی شار سەفەر دەکات, لەبەرانبەریدا پیاوێك دادەنیشێ کە چاویلکەیەکی قورسی لەچاوکردووە, شنەبایەکیش لەپەنجەرەکەوە یاری بەقژە خۆڵەمێشیەکەی دەکات, نیرۆ هەست دەکات, ئەو پیاوە بەبایەخەوە چاودێری دەکات, بەڵام سروشتی خۆی وایە کە بەدەگمەن قسە دەکات جا چ لەپێش پیاوبوبێ یاخود ژن, لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەم ژنە پارێزگارە توشی ڕاچڵەکین دەبێ لەکاتی دابەزینیی بەپەیژەکەدا بۆئەوەی بڕواتەوە, بۆی

دەردەکەوێ کەجانتاکەی بەهەڵە لەگەڵ جانتایەکی تری لەوشێوەیە گۆڕاوە, چونکە جانتاکان هەمان شتن بەلاّم ناواخنیان جیاوازە, ئەوکاتە تێدەگا کە ئەم جانتایە هی ئەو پیاوە پرچ خۆڵەمێشیەیە, پیاوەکەش بەدەمیەوە پێدەکەنێ کاتێ کەجانتاکانیان ئاڵوگۆڕ دەکەن بۆیە نیرۆ ناچاردەبێ کەبزەیەك بیگرێو داوای لێبوردن بکات, چونکە ئەو هۆکاری ئەم هەڵەیە بووە, لەگەڵ ئەوەی کەبەیەکەوە زۆر قسە ناکەن بەلاّم هەست دەکەین لەکاتی رۆیشتنیان لەسەفەرەکەدا سەرنجێك ئاڵوگۆڕ دەکەن, بەکتوپڕی نیرۆ تەسلیمی خەودەبێو دوای هەڵسانی لەخەو دەبینێ کە بە بەتانیەکی گەرمو تەنك تا ژێرپێی داپۆشراوە, کێ ئەوەی کردووە؟

بینی پیاوەکە بەگۆڤارێکی کراوەی نزیك چاوی دانیشتبوو, دڵنیایە ئەو ئەو کارەی کردووە؟ ئایا ئەو شێتە؟ چونکە ئەو ژنێکی پێگەیشتووەو دایکی چەند کوڕێکە ئەویش بەم شێوەیە سەیری دەکات؟ ئەو تەمەنی گەورەیە بۆ ئەوشتانە! بەلاّم ئایا تەمەن گرنگە؟ دوانەیی ڕۆح سنورێك بۆ تەمەن یا شوێن یاخود کات دادەنێت؟ سنوورێکی قایم نییە لە هاوڕێیەتیدا.

دواتر دەبینین کە نیرۆ ئەو پیاوە بێوە مێردە بەوشێوەیە دەناسێ, لەلایەکەوە, لەلایەکی تریشەوە باوکی هاوڕێی کوڕەکەیەتی, هێدی هێدی ئەو خۆشەویستییەی نێوانیان گەشەدەکات, بەلاّم ئەو ژنە هەموو پەیوەندییەکی توند ڕەت دەکاتەوە, چونکە ئەو هەموو ژیانی بەخێزانەکەی خۆی بەخشیوە , ئەو جۆرە خۆشەویستیەی کە بەدرێژایی ژیانی نەیبینبوو لە کاتێکی ناگونجاودا سەریهەڵداو وای لێدەکا کۆمەڵێك پرسیار بوروژێنێ کە پێشتر نەیکردوون و, هەروەها بیر لەزۆر شتیتر بکاتەوە بەلاّم نوسەر (شەوکەت عەلی) لۆژیك و واقیعی شتەکان لەبیر ناکات و کەسانی نێو واقیعەکەش بەهەمان شێوە, بۆیە لەکۆتایی ڕۆمانەکە دەنوسێت:

لێرەدا خۆشەویستی وەکو ڕەنگەکانی ئاسمان لەکاتی ڕۆژئاوابوندا دەردەکەوێت, ڕەنگە خۆشەویستی وەکو ئەوڕەنگانەی لەکۆتایی ئەو





ڕۆژەدایە لەکۆتایی تەمەن دەربکەوێ, ئەگەرچی زۆر بەدەگمەن ئەو خۆشەویستییە ئەنجامی دەبێت بەلاّم بوونی دەبێت, جیاوازییەکەش لێرە ئەوەیە کە هەندێ دەریدەبڕن و هەندێکی تریان ناتوانن بەهەناسەیەك گوزارشت لە ئاوێتەبوونی ڕۆحی و جەستەیی خۆیان بکەن. هەندێ وا لەسەرژیان دەنوسن بەو شێوەیەی کە خۆیان دەیبینن. ئەم تێڕوانینەش شوێن و پلەی یەکەمی هەیە لە کارەکانیاندا, بەلاّم هەندێکی تریان بەوەناوەستن وەکو کە هەیە, بەڵکو هەوڵ دەدەن شتێك لە هۆشیاری بۆ مێشکی خوێنەر وەکو نموونەی بەرز دروست بکەن.

ئەم نوسەرانە ڕازی نین تەنیا تێڕوانینیان بۆ ژیان ئەوەبێ کە لەواقیعدا ڕوودەدات یا لەدەوروپشتیان هەیە, بەڵکو بەدوای ئەو هۆکارانە دەگەڕێن کە دەبنە هۆ بۆ ئەوڕووداوانەی دەوروبەریان, ئەمەش بە ئەرکێکی ئەخلاقی خۆیان دەزانن, کە هۆکاری ڕوودانی شتێك پێش ڕوودانی پیشان بدەن. وئامانجیش لەودیوی ئەم کارانە لەسەر بنەمای هەڵوێستی ئەو نوسەرانە وەستاوە.

چیرۆك لەئەدەبی بەنگلادیشدا لەسەر دووڕێچکە دەدوێ, ئەوەی کە ڕوودەدات و ئەوەشی کە پێویستە ڕووبدات واتە (واقیع و نموونەیی) ڕۆمان و چیرۆکەکانی (رەشید کەریم و شەوکەت عەلی) بەشەفافییەتەوە باس لە واقیعی ژیان دەکەن, کەسایەتی نێو چیرۆکەکان لەسەر ئەرزی واقیعن و نافڕن بۆ دونیای خەیاڵ و قەبوڵی لۆژیك و واقیعی ژیان دەکات و هەوڵ دەدەت ئەوشتانەی کە لەواقیعداو لەوسنورەی کە واقیعەکە ڕێگەی پێداوە, خۆشیان بوێن, بۆیە ئەم دوونوسەرە هەوڵی دوبارە ڕێکخستنی کۆمەڵ نادەن, هەتا بەشێوەی پەنهان و نهێنیش, لێرە لەکارەکانیان گوزارشتێکی ڕاستگۆیی بەلاّم لەلایەکی ترەوە پێدەچێ قەڵەمەکەی نوسەر حەسەن عەزیز ئەلحەق زۆر بەپەرۆشە لە گوزارشتنی ئەو بیرکردنەوانەی کە شێوەو فۆرمی کۆمەڵ دووبارە دەکەنەوە, نوسینەکانی قسە لەسەر ئەوشتە ڕەتکراوو ریشەییانە لەژیان دەکات لەبری ئەوەی قسە لەسەر ژیانێکی نمونەیی بکات, دیارە کە ئەودەیەوێ لەوشتانەی کە پێویستە

ڕەت بکرێنەوە بکۆڵێتەوە ، پێش ئەوەی لێکۆڵینەوە لەوشتانە بکات کە پێویستە قەبوڵیان بکات . بۆ لێکۆڵینەوە لەدیاردە باشەکان پێویستمان بە تێگەیشتنی خراپە هەیە, هەندێ جار هێڵێکی کوژاوە لەژیانی نمونەیی لەنووسینەکاندا لەمیانەی دیمەنە وەرگێراوەکانی واقیعی ژیان, بەرجەستە دەبێت.

ڕەنگە نوسەر وای بۆ چووبێت کە تارمایی وێنەکان پێبەپێ لە مێشکی خوێنەردا بەبەکارهێنانی توانا زەینییەکان‌و لەمیانەی پێشکەشکردنی چاکەو خراپە لەپاڵ یەکتریدا, ڕوون دەبێتەوە.

هەروەها وەلی ئەللأی نوسەر خەونێکی نمونەیی پێشکەش دەکات, بەوەی جوانیەکانی ئەودیو دیاردە خراپەکان, بەشێوازێکی کاریگەر بۆ ئارامکردنەوەی دەروونمان نیشان دەدات.



## بەشی حەوتەم

## ڤێرجینیا وۆلف و ئازادکردنی ژنان

ڕۆماننوسی بەناوبانگ (ك. م. فۆستەر) کە باسی کارەکانی ڤێرجینیا وۆلف (1941 – 1882) دەکات:

(بیرکردنەوە لە ئازادکردنی ژنان بۆتە خەونێك لە هەموو شوێنی نوسینەکانیدا، بیرکردنەوەیەك کە کاری لە هەموو ناخی ڤێرجینیا کردووە)، ڤێرجینیا ژیانی منداڵی و گەنجی خۆی لە چەرخێکدا بەسەر بردووە کە کۆمەڵگەی ئینگلیزی لە قۆناغی نزیك لە کۆتایی هاتنی کۆت و بەندی سەردەمی ڤیکتۆریدا بووە. لەو کاتەدا باوکی ڤێرجینیا (لزلی ستیڤن) ڕۆشەنبیرێکی بەناوبانگی ئینگلتەرا بووەو کابرایەکی لیبرال بووە ولایەنگری بەلای فەلسەفەدا هەبووە. کۆمەڵێك کتێبی گرنگی لەبارەی فەلسەفە و مێژووی ئەدەبەوە نوسیوە، بەڵام لە ژیانی تایبەتی خۆیدا لەژێر کاریگەری ئەخلاقیاتی ڤیکتۆریدا بووە.

ڤێرجینیا لە ڕووی تەندروستیەوە شلەژانێکی هەبووە، بۆیە لە ماڵەوە زانست و زانیاری فێربووە و باوکیشی هەموو لایەنەکانی پەروەردەیی ڤێرجینیای گرتۆتە ئەستۆی خۆی. لەژێر کاریگەری پێشنیارەکانی باوکی و هاوکات بەئارەزووی خۆشی، کارە فەلسەفیەکانی هەریەك لە ئەفلاتۆن، سپینۆزا، هیوم و زۆری تر لەو کتێبە دانسقانەی خوێندۆتەوە و هەمیشە کتێبخانە تایبەتیەکەی باوکیشی لەبەردەستدابوە.

هەریەك لە ئەندامانی خێزانەکەی ستیڤن پێکهاتەیەکی تایبەت بەخۆیان هەبووە کە تێکەڵەیەك لە ئاکاری باوو تاکڕەوی تێدابووە،پاشان پەیوەندیان لەگەڵ کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیران و بەهرەداران لە زانکۆی کامبریدج دروست کردوە، هەموو بەیەکەوە بە دڵسۆزیو پەرۆشەوە کاریان کردوەو بازنەیەکی رۆشنبیریان دروست کردوە کە دوایی ناونرا بە((گروپی پلومز پێری)). ئەم گروپە رۆشنبیریە لە کاتی خۆیدا شوێن و پێگەیەکی گرنگی لە مێژووی ئەدەب و هونەرو ڕۆشنبیری ئینگلتەرا داگیر کردوە. چونکە ئەندامانی ئەم گروپە خاوەنی هەستێکی بەرزو ئارەزوویەکی هونەری و ئاکار یجوان وشەیدای لێکۆڵینەوە لەمەسەلە ئەخلاقیەکان بوون و ئەمەش بەهۆی پەیوەستبوونی بیرو بۆچونەکانی ئەوان کە لەژێر کاریگەری کەسێتی و بیرو بۆچوونەکانی جۆرج ئەدوارد مۆر بوون فەیلەسوفی بەناوبانگی کامبریدج(1873– 1985).

ڤێرجینیا لە ساڵی 1912 شووی بە لیۆنارد ۆولف کرد، شوکردنی خۆی و خوشکەکەشی کە ناوی (ڤانیسا) یە بە کلایڤ بیل دوو هاندەری سەرەکی بوون بۆ پتەبوونی پەیوەندیان بە ئەندامانی گروپی (پلومزپێری).

ئەم گروپە بەهۆی ئەو هەموو سۆزو خۆشەویستیەی کە ئەم دوو خوشکە بۆئەوان هەیانبوو، ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو بەهێزبوون دەچوو، بۆیە هەریەکەیان لەبواری خۆیدابەهرەیان دەرکەوت و کاریگەریان لەسەر ئەدەب و ڕۆشنبیری ئینگلتەرا جێهێشت،(2) .ڤێرجینیا ناوبانگی ڕۆماننووسی بۆ خۆی بەدەست هێنا ,ئەو بنەمایانەی کە ئەو هێنایە نێورۆمان, لە بواری هونەریەوە زۆر سەنگین بوو. کۆمەڵێك تاقیکردنەوەی کرد لەسەر شێوەو ناوەرۆکی رۆمان ، بەڵام ئەگەر چی کاریگەری هەندێ لەباوەڕە ئەخلاقیەکانی بەسەرەوە بوو,کەچی هەوڵی نەداوە بۆ چوونەکانی خۆی لەمیانەی رۆمانەکاندا بخاتە روو یان بڵاویانبکاتەوە .



ڤێرچینیا ووتاری جۆراو جۆری نوسیوە لەمەڕبەها کۆمەلاٚیەتیەکان و ڕاو بۆچونی لەمەسەلە جیاجیاکاندا کە گوزارشت لە ڕاو هەڵوێستەکانی خۆی دەکات,

لە بیرو باوەرەکانیدا گوزارشت لەبەرژەوەندیەکانی ئازادبوونی ژنان دەکات دژی شەڕو دەست بەسەردا گرتنی خاك و نیشتیمانی ژن لەمیانەی رۆمانی (ژووری تایبەت بە خۆمان_غرفه خاصه بنا) لە ساڵی (1929) و سێ جونەیهی لە ساڵی 1938 (3), کە لەڕووی شێوەوە نوێکاری زۆری تێدا کردبوو، لە ڕۆمانی (ئۆرلاندۆ) 1928 دا بە بەڵگەی روون و ئاشکرا گوزارشت لە پرسی ژن دەکات و لێرەدا جەخت لەسەر سروشتی مرۆڤ (خەسڵەتی دوانەیی) دەکاتەوە بۆ ئەوەی پەرژینی نێوان ژن وپیاو، بسڕێتەوە.

بۆ ئەوەی شتێك لەبارەی بۆچون و چالاکیەکانی ڤێرجینیا بڵێین سەبارەت بە ئازادکردنی ژنانەوە، پێویستە ئاماژە بدەین بە بیروڕا سەرەکیەکان وفەلسەفەی ژیانی ئەو کۆمەڵەیەی کە ڤێرجینیا ئینتمای بۆی هەبوو ، ئەم فەلسەفەیە بەشێوەیەکی جەوهەری و نزیك لەیەکتر لە هەموو کارەکانیدا دەبینین لەبەر ئەوەی لەژێر کاریگەری چێژی هونەری ئەو کۆمەڵەیەو تێڕوانینی فراوانی لەژیاندا, بوو.

لێرەوە رامانێك بۆ خەسڵەتی بزاڤی کۆمەڵەی (پلو مز پێری) دەکەین لە میانەی ئامادەییان لە بەشداری بزاوتە هونەریەکان و ئەدەب و هەڵوێستی ئەندامەکانی لەمەر دۆخی شەڕو ئاشتی و شارستانیەت و ئازادکردنی ژنان و ئازادکردنی عەقڵی تاك، مەبەستیان لە شارستانیەت پەرەپێدانی تواناکانی فیکری مرۆڤە و دامەزراندنی کۆمەڵێك کە لۆژیك بەگرنگترین خەسڵەتەکانی گفتۆگۆی دایەلۆگی نێوان خەڵك دابنرێت و پەرەسەندنی کۆمەڵ لەڕێگەی ئازادکردنی عەقڵ، جولان بەرەو ڕێگای شارستانیەت بەم هەموو خەسڵەتانە دەبێ بە واتایەکی تر، پەرەسەندنی شارستانیەت تەنیا لە دۆخی سەروەری لۆژیك و ئەقڵ دەبێ، پێوانەی

شارستانیەت بەلای ئەوان باوەڕبوون بە توانای لۆژیکی ئەقلانیەت وپەسەند کردنیەتی.

بەدیهێنانی ئازادی تاك لە سۆنگەی بەرهەڵستکردنی نەریت وفشارە دەرەکیەکان ومتمانە بە تواناو زیرەکی کەسێتی ، تاك دەگەیەنێتە پلەی بڵند لە کۆمەڵی شارستانی و بەتایبەت بەبەکارهێنانی توانا فیکریەکانی، بەلام ئەگەر ژیانی وەکو( کۆمەڵی درندە یا نیوە درندە) ، لاسایی کردنەوەی ئەوانی تر بێ لە ژیانی تایبەتیشدا تواناکانی لە داهێنان و دروست کردن ون دەکات، تا وایلێدێ هێزو فشارە دەرەکیەکان دەیخنکێنن.

دروشمی کۆمەڵەی پلومزپێری بریتی بوولە ((هونەر سەربەخۆیە)) ، واتە هونەر ماناو لۆژیکی لەناو خۆیدایە، هەموو ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە دان بە گرنگی داخوازیەکان لە ئەدەب و هونەرەجوانەکاندا و فۆکس کردنە سەریان دەنێن. چوون ئەوان پڕو پاگەندە ناخەنە ئەو بوارانەی کە لە پسپۆری خۆیاندا بەکاری دەهێنن ، ئەوان بە دوای رزگار بوون لە دونیای ناوەوە و دونیای (شێوەتایبەتیەکان) دەگەرێن، لەلایەکی تریش ئەوان دژی توندوتیژی بوون. هەروەك بەکردەوە دژی شەڕبوون، لای ئەوان هاوڕێیەتی بەرزترین پایەبوو وهەوڵیاندەدا ئەو باوەڕە لە رەفتارو پەیوەندیەکانی نێوان خۆیاندا رەنگ بداتەوە.

((ژورێك تایبەت بە خۆمان)) لە کتێبە هەرە شەفافەکانی ڤێرجینیایە لە مەڕ کێشەی ئازادبوونی ژنان. ڤێرچینیا لە ئۆکتۆبەری ساڵی 1928 بەشێك لەو دوو وتارەی لە (کۆمەڵەی کامبریگ بۆ هونەر) خوێندۆتەوە، دواتر ئەم دوو وتارەی بەهەندێك دەسکاریەوە بەو ناوونیشانەی سەرەوە کردووە بەکتێبێك، ئەم کارەی ڤێرچینیا جیاوازیەکی تەواوی لەگەڵ سروشتی کارەکانی دیکەیدا هەیە،کە لۆژیك بەوپەڕی ووردبینیەوە ناتوانێ دیدی هونەریانەی ناخ و هەستی ڤێرچینیا بشارێتەوە.

لێرەدا بەروونی مەسەلەکان نمایش دەکات. ناوەرۆکی ئەو مەسەلانەش ئەوەیە کە کۆسپە کۆمەلایەتی و ئابوریەکان بەر پرسن لە



بەرانبەر دواکەوتویی و لاوازی ژناندا,بۆیە لەسەر نوسەرێکی ژن پێویستە دانی پێدابنێت و سەرکەوێ بەسەر ئەو کۆسپە زۆرانەی کەخۆپەرستی ماددی وبەکاربردنی باوی پیاو لەرێگەی ئەو کۆمەڵگایەی حوکمی دەکات سەپاندویەتی .

بەڕای ئەو کەمترین مەرج بۆ ئازادبوونی ژن لەوەدایە کە هەموو کچێك ژوورێکی بۆ خۆی هەبێت و کلیلی ئەو ژوورەش لە دەست خۆیدا بێ، بۆ ئەوەی لە ژوورەکەی خۆیدا هەمان ئەو سەربەستیەی براکەی هەبێت .

هەروەها ڤێرجینیا وای دەبینێ کە ژنی نووسەر پێویستی بەئابووریەکی سەربەخۆ هەیە بۆ ئەوەی نوسەرێکی بەرهەمهێن بێت. پێویستە داهاتێکی بۆ دابین بکرێ کە نزیکەی (500 جونەهی ئیسترلینی) بێت لە ساڵێکدا، ئەو برە پارەیە لەو کاتەدا – 1928 بۆ هەر تاکێك بەس بووە). چونکە پشت بەستنی ژنان بەدەستکەوتو ماددی پیاوان، کەسێتیەکی لاواز دەبەخشێتە ژن کە باوەڕی بە خۆی نەبێت, یاخود وەك بووکەشووشەیەك کە تەنیا بۆ خوشگوزەرانی و ئارەزووەکانی پیاوان بەکار بێت، ژن بەمانای ووشە ناتوانێت مرۆڤ بێت لە کۆمەڵگەیەکدا کە پیاو حوکمی بکات ، چونکە ئەگەر ژن بەدەسەلاتی کۆمەڵ لەسەر خۆی رازی بوو , ئەوا دەبێتە ژنێکی ئیفلیج و ئەگەر نارازییش بوو بە چەوسانەوەی کۆمەڵ ئەوا بریندارو ماندوو دەبێت و دواجاریش خەمۆکی دەوری دەدات ,

لێرەدا دەبینین زۆربەی جار بەرهەمە هونەریەکانی سیمایەکی نەگەتیڤی بەیان دەکەن, هونەرمەند لە کاتی یەکگرتنی توخمەکانی نێرو مێ لەناخیدا دەبێتە مرۆڤێکی تەواو داهێنەرو زانا لە ئەدەب یان هەر بوارێکی تردا ،. بە گشتی بواری هونەری تاکە بوارە کە هونەرمەندی هەست ناسك و خاوەن سۆز دەتوانێ تیدا کاری داهێنەرانە ئەنجام بدات بۆ سەرکەوتن بەسەر جیاکاری و جیاوازیە باوەکان، کەسێك کە نغرۆ بێت لەنێوان بیری ژنێتی وپیاوەتیدا وبانگەشەی نایەکسانی بکات ناتوانێ کارێکی هونەری پربایەخ ئەنجام بدات، پێویستە هونەرمەند بە بیری

دوانەیی ئاشنا بێت تاکو بتوانیٚ شتی جوان وباش بخاتە روو هەروەها پێویستە لەسەر ژن ئەو هۆکارانە لەبەر چاو بگریٚ بۆ ئەوەی خەونە هونەرەکانی بەجێبهێنیٚ. دەنا هەوڵەکانی بە بادا دەڕوات.

ڤێرجینیا لە پێشەکی ئەو کتێبەیدا بەگاڵتە جارییەوە باس لەوەزعی نابەرابەری کۆمەلأیەتی و ئابووری دەکات کە لەسەر بنەمای ڕەگەز سەپێنراوە تەنانەت لە ناوەندی ئەو چینە تێگەیشتوەشی کە ئەو لێی دەژی, ئەو بەراوردێك لەنێوان (کۆلێژی ئۆکسس بریجی پیاوان) و (کۆلێژی ڤێرنهامی کچان) دەکات، لەگەڵ جیاوازیە گەورەکانی نێوانیان.. لەسەر خوێندکارانی ئۆکسبریج دەڵیٚ:

((زەرورەتێك بۆ پەلەکردن نیە، هەروەك زەرورەتێك بۆ سەرکەوتنیش نیە تەنها زەرورەت خۆمانین، هەموومان دەچینەوە ئاسمان و (ڤاندایەکی) وێنەکێشمان (4) لەگەڵ دەبێت بە هەموومانایەك ئەوژیانەچەندخۆشەو خێراتەکانی بەلەزەتن چەندێکیش ئەو گلەییانە بیٚ مانان، چەند هاوڕێیەتی نێوان پیاوان خۆشە(5) لەو کاتەی کەبەتەنیشت شووشەی پەنجەرەکەوە دانیشتوین وجگەرەیەکی تر دادەگیرسێنین.... هتد))

ئەوە کوٚی ژیان و گوزەرانە لەو زانکوٚیەدا بەلأم ژیان لە (ڤێرنهام) چەند جیاوازی هەیە، ئاستی ژیان نزمترە، سەربەستی نیە، هیچ بیمەیەك بۆ پێشکەوتنی خود نیە، ئەگەر بارو دوٚخی ڤێرنهام وەك ئۆکس بریج بوایە بەم شێوەیە دەبوو:

((ئەوشەوە بەهێمنی دادەنیشتین و بۆ نموونە باسی زانستی شوێنەوار زانستی ڕووەك، ئەنترۆپۆلۆژیا، فیزیا، سروشتی گەردوون، ماتماتیك، فەلەك یاخود جوگرافیامان دەکرد، ئەگەر دایکی خاتوو ستۆن (seton) لە پێش خۆیدا فێری هونەری مەزنی دروست بوونی سامانی بکردایە وەك باوکیان و باپیرەیان خۆیان بەخت بکردایە بۆ وەرگرتنی خەلأتی گەورەو بەخشینی پاداشت بۆ کچانی هاوڕەگەزیان لە زانکۆدا، ئەوا ئێستا ئێمە دەمان توانی بوتلێکی پاك هەڵقورێنین وگۆشتی باڵندە بخۆین و بەباوەڕبەخۆ بونێکەوە بڕوانینە داهاتووی جوان و ڕێزداری



خۆمان. لەیەکیٚ لەپیشە ئازادەکانی کە پێویستی بە بەهرەیە، گەردونمان دەدۆزیەوە یان، خەونمان، نوسینمان لە شوێنە پایەبەرزەکانی زەوی دەبینی و دادەنیشتن لەسەر پەیژەی (ثار ثینون) کە (پەیکەری خوای یۆنانیەکانە لە ئەسینا...و)، یان دەڕۆیشتین بۆ ئۆفیس لە کاتژمێر 10 داو لە چوارو نیودا دەگەراینەوە بۆ نوسینەوەی کەمێك هۆنراوەو شیعر خەیاڵ دەیبردینەوە(6).))

ڤێرجینیا دەڵیٚ: هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو جیاوازیە زۆرەی نێوان هەردوو کۆلیژەکە دەگەڕێتەوە بۆ پاشکۆبوونی ئابووری ژنان لە کۆمەڵدا، هۆکاری ئەو پاشکۆیەتیەش دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بەکاربردنەی ژنان کە لە ناخی ئەو کۆمەڵگەچەق بەستووەی پیاو حوکمیتێدا دەکات.,دایە.

خاتوو ستۆن و دایکیشی نەیانتوانیوە پارەیەکی زۆر کۆبکەنەوە و کۆلیژێك و کتێبخانەیەکی پیٚ دامەزرێنن، لەبەر ئەوەی لەباری یەکەمدا ئەوە شتێکی مەحاڵ بووە و لە دوەمیشدا ئەگەر بیانویستایە ئەوەش بکەن ئەوا یاسا ئەو مافەی پیٚ نەدەدان. کۆمەڵ پێش 44ساڵ لەمەو بەرمافی خاوەنداریٚتی سامان و ماڵی بەخاتوو ستۆن دا ، لە چەند سەدەیەکدا ماڵو سامانی ژن , ماڵو سامانی مێردەکەی بوو. ڕەنگە ئەو بیرکردنەوەیە وای لەم خاتونەو دایکی و داپیرەی و ئەو زنجیرەیەی بە دواییدا دێت کردبیٚ کە لە دەرەوەی گەمەی بازاڕەکانی پارە دابن، لەناخەوە بیریان لەوە کردبێتەوە کە هەر عانەیەك بەدەستی دێنن مێردەکانیان لێیان بسەنن و بەئارەزووی خۆیان خەرجی بکەن، ڕەنگە بۆ خوێندنی خۆیان یا بۆ ڕێکخستنی سکوولەرپێدانیان لە پالیلۆل یاخود گینگس، کەواتە لەلام گرنگ نیە هەتا ئەگەر توانیشم، پارە کۆبکەمەوە چونکە ئەو شتانە بۆ پیاوەکەم بەجیٚ دەهێڵم (7).

بەبیٚ گومان ڤێرجینیا ئاماژە بەوە دەکات کە داهاتوویەکی ڕۆشن چاوەڕێی ئەو پیاوانە دەکات کە لەکۆلیژی پیاوان دەخوێنن، ئەوان ڤاندایەکی (وێنەکێش) داهاتوو دەبن و بەپەڕۆشەوە چاوەڕێی وێناکردنی کەسێتیان دەبن ودواجاریش لە ژیانی ڕۆژانەیاندا سەرکەتوو دەبن ،

چونکه داهاتوویان زامنه ئەویش بەوەرگرتن و دابین کردنی کارو وەزیفه و داهاتێك بۆیان و بەدیهێنانی ئازادیو پلەو پایە کۆمەلاٚتیەکان، بەلاٚم کچانی کۆلیژی ڤیرنهام چ داهاتوویەکیان دەبیٚ؟ ڤێرجینیا لێرەدا لە میانەی شیکردنەوەی هۆکاری ئەو بارودۆخەی کە ڤێرنهام هەرگیز وەکو ئۆکسبریج نابیٚ دەلٚێت:

((پێش لە دایکبوونی منالٚ (9) مانگ هەیە، لە دواییدا منالٚەکە لە دایك دەبێت و دواتر (3 یان 4) مانگ بۆ شیردانی منالٚ پێویستە، دوای شیردانی منالٚ بەدلٚنیاییەوە پێنج سالٚ بۆ یاری کردنی مندالٚ دانراوە، بۆیە پێدەچیٚ نەتوانریٚ مندالٚ لە شەقامەکاندا یاری بکەن چونکە دەگوتریٚ ئەو منالاٚنەی لە شەقامەکانی روسیادا یاری دەکەن دیمەنێکی ناشرینیان هەیە، هەروەها دەگوتریٚ ماوەی پێگەشتن و دروست بوونی مرۆڤ لە نێوان یەك سالٚی تا پێنج سالٚیدایە. ئەگەر خاتوو سیتۆن، وەکو گوتم، کە خۆی خەریك بکردایە بە کۆکردنەوەی پارە لە جیاتی مندالٚ بوون، چی دەبوو؟ ئەو یادەوەریانەی کە لەیاری کردن و شەڕکردنی مندالٚەوە بۆی بەجیٚ ماوە چین؟ چیت دەزانی دەربارەی سکوتلەندا و هەوا پاکەکەی و کێك و بێجگە لەمانەش؟ بەلاٚم پێویست بەم پرسیارانە ناکات، چونکە تۆی ژن لەو حالٚەتەشدا لە بنەڕەتدا هیچ بوونێکت نەدەبوو.(8) ))

ئەمە دۆخی ژنانە، گەورەترین کۆسپ لە بەردەم ئازادبوونی ژناندا عیشقی ئەوانە بە غەریزەی دایکایەتی، ئازادی ئابووری گرنگە بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپە، بەلاٚم ڤێرجینیا لێرەدا بۆگۆڕانکاری بنەڕەتی لە کۆمەلٚی خۆیدا هیچ پێشنیاروبۆچونێك ناخاتە روو.

بۆ گەیشتنی ژنان بە ئابووریەکی سەربەخۆ:

ڤێرجینیا لەبەشی دووەمی کتێبەکەیدا (ژوورێك تایبەت بەخۆمان) وەسفی ئەزموونەکانی خۆی دەکات, سەبارەت بەسەرچاوەی ئەو هەژاریەی لە نێو کۆمەلٚی ژناندا هەیە ، بەمەبەستی هێنانی زانیاری دروست کەپشتی پیٚ دەبەستیٚ بۆئەو بابەتە چووە بۆ کتێبخانەی



مۆزەخانەی بەریتانی ، کە سەرچاوە و بەلٚگەیەکی باوەرپێکراوە لەسەر ئاستی جیهاندا .

لەویٚ لەنێو ژمارەیەکی زۆر لەو کتێبانەی کە هەلٚدراوەتەوە بینی چەند کتێبێك هەبوون لەشێوەی گۆڤار کە ڕای یەکلانە و لایەنگری تێدابوو. بەهانە بۆ ئەم هەژاری و جیاکاریە دێننەوە و لە گۆشە نیگای بیرکردنەوە دواکەوتوو و رابردووەکان قسەو باس دەکەن، بەبیٚ لۆژیك، کە هەموش نووسەر و توێژەری رەگەزی پیاوانن، ئەو لۆژیکەی ئەوان پیٚ دەدوێن ئەوەیە ((دواکەوتویی ژنان دەگەڕێتەوە بۆ دابەزینی ئاستی زیرەکی وسروشتی لەش و ئاکاریان)) ڤێرجینیا لەو ئەزموونە بە گیانێکی بریندارەوە وەکو ژنێك دەرچووە، بەم شێوەیە ناڕەزایی توندی دەردەبڕیو دەپرسیٚ:

ئایا دەزانن ژمارەی ئەو کتێبانەی سالاٚنە لە جیهاندا لەسەر ژنان چاپ دەکرێن چەندن ؟ ئایا دەزانن چەندن ژمارەی ئەو کتێبانەی کە پیاو دەیاننوسن؟ ئێوە خۆتان درکی پیٚ دەکەن؟ ڕەنگە ژنان زۆرترین مەردومێك بن لەبونداکە دیراسە نەکرابن(9).

پیاوان لە ڕێگەی ئەو کتێبانەوە رقی خۆیان بەرانبەر ژنان دەردەبڕن، بەلاٚم ئایا هۆی بیر تەسکی ئەو پیاوانەی کە خاوەن ئاستێکی بەرزن لەزانست و لۆژیکدا چیە؟ ڤێرجینیا دەلٚیٚ:

لەژێر تیشکی لێلٚ و سۆزێکدا نوسیویانە، نەك لەژێر تیشکێکی ڕاستەقینە(10)، پیاوان پێشتر کۆنترۆلٚی هەموو بوارێکی ژیانی کۆمەلاٚیەتیان کردبوو، چونکە ململانێی ئەوان لەگەلٚ ژناندا هێشتا دەستی پیٚ نەکردبوو؟ کە واتە بۆچی ئەوان ئەوهەموو ڕق و تورەییەیان بەرانبەر بە ژنان هەیە ، ڤیرجینیا دەلٚێت:

ئایا ڕق ((بە هەر شێوازێك بیٚ)) دێوەزمەی هێزە ؟ نموونە زۆرجار دەولٚەمەندەکان تووڕەن لە هەژارەکان لەبەر ئەوەی پێیان وایە ئەوان دەیانەویٚ دەست بەسەر سەروەت و سامانیان دابگرن (11).

هەروەها ژنان بەهەمان شێوە ڕووبەڕووی هەندێ لەو بەرپرسیاریەتیە دەبنەوەلەبارەی ئەو دیاردەیەی  کە پیاوان خۆیان لە پایەیەکی بەرزتر دادەنێن، ژنانیش  زیادە ڕۆیی دەکەن لە بەرزنرخاندنی پیاوان، ئەمەش گرێی خۆ بەزل زانین لای پیاوان زیاتر دەکات. ڤێرجینیا لەو بارەیەوە دەڵێت:

(ژنان بەدرێژایی سەدەکان  ڕۆڵی ئاوێنەی سیحریان بینیوە کە چۆن وێنەی پیاوانی دوو قات لە خۆی گەورەتر نیشان داوە) چونکە گەربێتو راستیەکەی بڵێین، ئەوا وێنەکە کاڵ دەبێتەوە تواناکانی پیاوان کەم دەبێتەوە،لەبەر ئەوە ژن بۆئەو زۆر گرنگە چونکە زیندوویی پێدەبەخشێتەوەو کۆ ئەندامی دەمارەکانی بەهێز دەکات(12).

ڤێرجینیا گفتوگۆ لەسەر ووتەکانی ئەسقەفی بەسالأچوو دەکات بۆ ئەوەی لەوهۆکارە سەرەکیانە بکۆڵێتەوە کەبونەتە هۆی شکستی گەشەکردنی بەهرەکانی ژنان بەدرێژایی ژیانیان ,ئەسقەف کە دەڵێت: (شتێکی مەحاڵە ژن بلیمەتی شکسپریان هەبێ، پێشتر مەحاڵ بوو، ئێستاش هەر مەحاڵە، بۆ داهاتووش هەر مەحاڵ دەبێ.)

ڤێرجینیا بۆ زەمەنی پێشوو هاوڕایە لەگەڵیدا، کە نەتوانراوە لە سەردەمی شکسپیردا ژنێك وەك ئەو بینوسیایە بەلأم هۆکاری ڕاستەقینەی پشت ئەو مەحاڵ بوونە چیە؟ بۆ وەلأمی ئەم پرسیارە خەیاڵی بۆ بوونی، جودیث شکسپیر دەڕوات کە خوشکی ولیەم شکسپیرە، وا دابنێین کە (جودیث) بەهرەدار بووە هەروەك ولیەمی برای کە چۆن خاوەنی پلەو پایەی بەرز بووە ، ئەو واتە (شکسپیر) چووە بۆ لەندەن بەدوای نان پەیداکردن لەوێ بۆتە هونەرمەندێکی شانۆکار و نوسەرێکی بەناوبانگ هێدی هێدی شارەزایی زۆری پەیداکردو ئەوەش یارمەتیدا بۆ پەرەسەندنی خودی خۆی، لەدوایدا و لە قۆناغە جۆراو جۆرەکاندا کۆمەلگە دەرگاکانی خۆی بەروویدا کردەوەو وای لێهات لەنێو تەواوی کۆمەڵ و خەڵکان لەسەرتاسەری جیهاندا بناسرێت .



با بزانین لەگەڵ ئەوباوەرەی لەسەرەوە باسمان کرد دەربارەی شکسپیر چی بەسەر خوشکی ئەو بەهرەمەندە داهات،

(( پێشتر ئەویش دەگەڕا بەدوای ئەزموونە جۆراو جۆرەکانی و خەیاڵێکی فراوانی هەبوو کە وەك ولیەمی برای ئامادەیی هەبوو ئەزموونەکان بە هەموو ڕەنگەوەو هەموو ئەوانەی کەجیهان بەخشیویەتی بە مرۆڤ ببینێ , بەلأم ئەو نەنێردرا بۆ قوتابخانەو کەسیش فێری خوێندنی زمان و ئەدەب و هیچ بەشێك لە زانستی نەکرد، ئەو تەنها ئەوەی هەبوو کە ئەگەر هەلێکی بۆ ڕێکەوتایە ناوەناوە لاپەڕەکانی کتێب و کاغەزە نوسراوەکانی ولیەمی برای هەڵدەدایەوە بەلأم ئەوە زۆر بەدەگمەن بوو، چونکە ئەو کچە لەسەری بوو بچێت شتومەك و پێداویستی ماڵ بکرێت و بیهێنێتەوە  پێویست بوویارمەتی دایکی بدات لە ئیش‌وکاری ماڵ، بۆ نموونە کاری چنیین، (ڕەنگە چنینی گۆرەویەکانی ولیەم بوبێ) ئیشەکانی چێشتخانەو ئیش‌وکاری زۆری تریش. ئەو بەهیچ شێوەیەك سەربەخۆیی نەبوو، کاتی نەبوو یاخود کاتی بۆ نوسینی چیرۆکەکانی نێو خەیاڵی خۆی نەبوو,هەتا ئەو کاتەش کە جارناجارێ لە خوێندنەوەی کتێبەکان دەبۆوە. تەنانەت ئەگەر بەنهێنی شتێکیشی نوسیبێ نەیتوانیوە پیشانی براکانی یان باوکی بدات.

لەکۆتاییدا ئەو کچە ڕازی نەبوو بلێسەی ئەو بەهرەیەی کە هەیبوو بەهۆی پشت گوێ خستنی لەلایەن خانەوادەکەیەوە ,بکوژێتەوە  لەبەر ئەوە ڕۆژێك دێ شۆڕشێك بەرپا دەکات و لە ژێر زەبری پێداویستیەکانی ناخی هەڵدێ، ئەوەش پاڵی نا بۆئەوەی لە بازنەی تەسکی خێزان بێتە دەرەوە وئەو کاتەش تەمەنی نەگەیشتبووە حەڤدە ساڵی کاتێ کە لەماڵەوە رایکرد چونکە بەشی خۆی شارەزایی لە ژیان و واقیع و دونیای دەرەوە نەبووهەر بۆیە دواجار دەبێتە نێچیرێکی کۆمەڵگەی پیاو سالاری.

هەرچەندەلەدوا جاردا توانی لەسەر شانۆدا وەکو هونەرمەندێك بوەستێ بەلأم ئەو لەبەرئەوەی کاتی تەواوی بۆ زیاتر پەرەدانی بەهرەکانی لە نواندن و نوسین دانەبووبۆیە کەوتە هەڵەیەکی گەورە و

بەهۆی بوونی پەیوەندیەکی نهێنی لەگەڵ بەرێوەبەری کارەکەی،سکی پڕبوو لەکۆتاییدالە ژێر کاریگەری ناخۆشیەکانی وشکستە گەورەکەی خۆیدا ، خۆی هەڵدایە ڕووباری ((تامیز))لە کاتێکدا (( ئەوهونەرمەندەی کە بوە هۆیسکپربوونی جودیث)) دوای مردنی ئەو کچە وەك پاڵەوانێك بەخەمێکی دروستکراوەوە خۆی نیشاندا.

بەم شێوەیە ژیانی خوشکی شکسپیری زانا کۆتایی پێ دێت و دەبێتە قوربانی دەستی کۆمەڵ و پیاو سالاری ، چونکە ئەو هەرگیز وەکو پێویست ئەوپێداویستی و هۆکارانەی کە دەیگەیاندە ژیانێکی سەرکەوتوو, نەیبوو هەتا بەشێوەیەك یا لایەنی کەم سەرکەویٔ لە ژیانیدا ، بێگومان هۆکارەکانیش بۆسەرکەوتن ((ژینگەی هاندەربۆبوونی بەهرەمەندی و گەیشتن بەسەر بەخۆیی ئابووری و بوونی ئیرادە لە ژیاندا)) یە، ئەمانە هۆی سەرەکی بوون بەڕای ڤێرجینیا بەوەی ژنان لە رابردوودا نەیانتوانیوە بلیمەت بن و ئەوەش بەو مانایە نیە کەژنان کەم توانابوون لەچاو پیاواندا ،بەڵکو مادام یەکسانی لە مافەکان و هەلی ڕەخساو نیە لە نێوان ژن و پیاودا, بۆیە ناتوانین بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بەراورد لەڕێژەی تواناکانی بەرابەری بکەین ، دواکەتویی ژن بەڕای ڤێرجینیا دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سیستمێکی فێرکردنی باش بۆ کچان ,هەروەها دان نەنان بە مافە یاساییەکانی ئافرەت لە بارەی موڵکداریەتی لەڕابردوو ئەرکەکانی دایکایەتی کە بەسەریدا سەپێنراوە .

((سیٔ جونەیهە)) دووەمین کتێبی ڤێرجینیا یە لەمەڕ مەسەلەی ڕزگاربوونی ئافرەت، یەکەم جار وای بیرکردەوە کە ناوی لیٔ بنیٔ ((پیشەیەك بۆ ژنان)) دواتر ((بیٔ بەش بوون–الحرمان) بەلاٌم دوا جار لەژێر ناونیشانی (سیٔ جونەیهە) لە ساڵی 1938 دا بلاٌوی کردەوە.

لەم کتێبەدا بەهێزو ورەیەکەوە گوزارشت لە ڕایەکانی دەکات، بەلاٌم بەبیٔ روحی گاڵتە جاڕی و شێوازی (توندئامێز) وەك ئەو وێنەیەی لە ڕۆمانی (ژوری تایبەت بە خۆمان)دا بەکاری هێناوە. بەڵکو لێرەدا قسە لەسەر ئاشتی و ئازادی ژنان دەکات و بەرپرسیاریەتی خۆی بەشێوەیەکی





راستەوخۆپیشان دەدات وهەولٔ دەدات بۆچوونەکانی لەو ڕێگایەوە کاربکاتە سەر تەواوی جیهان. هەروەها دەپرسیٔ چۆن شەڕو ململاٌنێی مرۆڤ کۆتایی پیٔ دیٔ؟ ئەو شەڕانەی بەو پارانە بەرپا دەکرێن کە لە دوای ماندوبوون و ئازارێکی زۆر پەیدادەکرێن. ئەو ئامادەیە بۆ تەرخان کردنی (3جونەیهی) کە پاشەکەوتی کردووە بۆ ئەم مەبەستە بیدات.

ڤێرجینیا زۆر کاریگەردەبیٔ بەوسیٔ نامەیەی کە بەنوسراو بۆی هاتووەو هەریەکێك لەو نامانە داوای بەخشینی یەك جونەیهی لیٔ دەکات.

خەزنەداری کۆمەڵەیەك بۆ پارێزگاری کردن لەئاشتیو ئازادی‌یە ئابوری‌و مەدەنیەکان داوای بەخشین‌و کۆمەکی یەك جونەیهی لە ڤێرجینیا کردووە. هەروەك خاتونێکی تر کە خەزنەداری یەکێك لەکۆلیژەکانی ژنانە, بۆ دووبارە بیناکردنەوەی کۆلیژەکە داوای بەخشینی یەك جونەیهی لێدەکات, کەسی سێیەمی نامەکانیش خەزنەداری کۆمەڵەیەکی دیکە بوو بۆرەخساندنی هەلێك بۆ دامەزراندنی ژنانی پرۆفیشناڵ داوای کۆمەککردنی یەك جونەیهی لێکردووە, بۆ وەلاٌمی هەرسیٔ نامەکە ڤێرجینیا کتێبی (سیٔ جونەیهی)ی نووسی.

ئەم کتێبە دوای ئەوەی کەبلاٌو بووەوە لەلای ژمارەیەکی زۆر لەژنان پێشوازیەکی گەرم‌و پشتگیریەکی زۆری لێکرا, بەلاٌم لەگەڵ ئەوەشدا ئەندامانی کۆمەڵەی (پلومزبێری) وەکو پێویست زۆریان پێشوازیان لێی نەکرد.

لەو کتێبەدامەسەلەی مافەکانی ژنانی گریٔ دابوو بەئەگەری روونەدانی شەڕەوە وپیٔی وابوو ژنان مەیلیان بۆ ئاشتی زیاترە وەك لەپیاوان, ئەویش بەهۆی سروشتی خۆیانەوە, ئەگەر دەسەلاٌتیش بەدەست ژنانەوە بوایە, ئەوا ولاتان بیریان بۆشەڕوشۆڕ کەم دەبۆوە , لەم بارەیەوە ڤێرجینیا دەڵێت:

((لێرەدا سیٔ هۆکاری هەنوکەیی هەیە بۆئەوەی ئەو ڕەگەزە (پیاو) لەگەڵ یەکتری بەشەڕبێن, ئەوانیش, یەکەم شت, شەڕ پیشەیە لایپیاو, دووەمیش سەرچاوەیەکە بۆ کاریگەری‌و خۆشبەختی ئەوان, سێیەم

هۆش شەڕزۆر لە سیفەتەکانی ناخی پیاو پێکدێنیٚ, لەبەرئەوە پیاو بەبیٚ شەڕ دەفەوتێت.))

ئەو پیٚی وابوو ڕوحی شەرانگێزی یا کوشتاری وشەرسیمای پێکهاتەیی سایکۆلۆژیەتی نێرە. لەگەڵ هەرچەندە ژن‌و پیاو لەزۆربەی غەریزەکاندا وەکیەکن بەڵام شەرانگێزی هەمیشە خوویەك بووە لای پیاوان نەك لای ژنان.

ڤێرجینیا وەڵامی هەرسیٚ نامەکانی دایەوەو سیٚ جونەیهی پیٚ بەخشین, بەڵام ئەو ئامانجی سەرەکی ئەوەبوو کە رایانکێشیٚ بۆ بیرکردنەوە بەو شێوازەی کەخۆی مەبەستیەتی ئەویش بیرکردنەوەلەداماڵینی ئەو شێوازە کۆنەی فێرکردن و خوێندن:

((ئەگەر شێوازی فێرکردنی (کچە خوێندەوارەکان ) بەم شێوەیە بەردەوام بێت, ئەوا ئەو فێربوونە بۆ ئەم کچانە هیچ سودێکی نییە, هەروەك بۆ تەواوی کۆمەڵیش وایە؟))

چونکە دواجار فێری ململانیٚ‌و هونەری دەسکەوتنی سەروەت‌و سامان دەبن‌و شێوازێك بەکاردێنن کەئەوانی تر بێبەش بکەن‌و قەبارەی خۆیان‌و هێزی بەدەستهێنانی خۆیانی پیٚ زیاد دەکەن, ئەوە دۆزی فێرکردنەکەیە , کە ئەگەر بەردەوام بوو بەو رێگەیە شەڕەکان دووبارە دەبنەوە. کەواتە, پێویستەبەخشینی پارەی ئەو نەبێتە هۆی بیناکردنەوەی کۆلیژێك لەسەر سیستمی کۆن, بەدڵنیاییەوە بیناکردنەوەی ئەم کۆلیژە بەسیستمی نوێش هەر سەرکەوتوو نابیٚ. کەوابیٚ پێویستە نیشانەیەکی جیا لەسەر جونەیهەکان دابنرێت, ئەو نیشانانەش (تێکدان, پترۆڵ , دەنکە سقارتە ) بیٚ‌و پێویستە ئەو روونکردنەوەیەش زیادبکرێت:

((ئەو پارەیە بگرەو کۆلیژەکەی پیٚ بسوتێنە تا تەواو دەسوتیٚ‌و با گەڵا وەریوەکان سوربینەوەوکچانی خوێندەوار بەدەوری ئاگرەکەدا سەما بکەن, با دەستیان پڕکەن لەگەڵامردووەکان‌و فڕیٚی بدەنە نێو ئاگرەکەو دایکانی کچەکانیش لەپەنجەرەکانیانەوە هاواربکەن:





((بابسوتیٚ, بسوتیٚ, بێزاربوین لەو جۆرە فێرکردنە.))

ڤێرجینیا ئەو بیروڕایانەی کەلەسەر سیستمی فێرکردن هەیبوو, لەکردەوەولە نوسینەکانیدا رەنگی دەدانەوە , بۆ نموونە زانکۆی کامبریدج لەفبرایەری ساڵی 1932دا داوایەکی بەشداربوونی بۆ نارد تاکو وەکو وتەبێژێك بەشدار بێت لەموحازەرەکانی کلارك, بەڵام ئەو ڕەتی کردەوەو هەروەها لەفبرایەری هەمان ساڵدا لەزانکۆی مانجیستەر دکتۆرای فەخری پیٚ بەخشرا, بەڵام دیسانەوە لەو بۆنەیەدا ئەم بەخشینەی ڕەتکردەوە, لێرەوە ڕاستگۆیی‌و بەرزی ئاکاری یەکیٚ لەئەندامانی کۆمەڵەی پلومربێری دەبینین کە هەرگیز کەلێنێك لەنێوان باوەڕە تیۆرەکان‌و ژیانی رۆژانەیاندا, نیە.

ڤێرجینیا لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئارەزووی بوو بۆ بنیادنانەوەی کۆلیژەکە ئەو جونەیهە ببەخشێت, دوای ئەوەی ئاماژەی بەهەموو خەوشە سەرەکیەکانی ئەو سیستمی فێرکردنەدا,رایوابوو ئەگەر کۆلیژەکە رێك نەخرێتەوە, ئەوا کچە خوێندەوارەکان , دەگەڕێنەوە بۆئەشکەوتی ماڵە تاریکەکانیان. ئەو ئەشکەوتانەی سەرچاوەی هەژاری‌و توندوتیژی‌و خراپەکاری‌و نا مۆرالەکان .

(( ژیان لەوێدا بیٚ جوڵەو بیٚ مانایە, لەگەڵ ئەوەشی کە ژنان فێری خوێندنی باو دەبن‌و لەوێشدا وەکو پیاو فێری ئارەزووکردنی دونیای دەوڵەمەندی‌و تایبەت بەخۆیان دەبن, ئەگەرچی ئەم سیستمی فێرکردنە, سوکترین شەڕێکە, بەڵام ژنان هەندێك فێربن باشترە لەوەی هیچ فێر نەبن, چونکە نەبوونی کەمیش لەو فێربوونە وایان لێدەکات تاماون بەدبەخت بن‌و دوورکەوتنەوەش لەشەڕ لەو حاڵەتەدا دەبێتە شتێکی ناکردە, چونکە دادەوەرەکانی ئەم (دونیا نایابە) وەسفی ڤێرجینیایە– وەرگێڕ) هەموویان ئەندامی ڕەگەزی نێرن. ئەگەر ژنان توانیان پەروەردەو فێرکردنێکی دروست وەربگرن, ئەو کاتە نەوەی داهاتوومان مەیلی بۆ ئاشتی‌و دادپەروەری دەڕوات, ئەو کاتەش دەسەڵات لەپیاوەوە دەگوازرێتەوە بۆ

ژنان‌و ئه‌وانیش دژی بیركردنه‌وه‌ی هه‌ڵگیرساندنی شه‌ڕن له‌ ناخیاندا, به‌وه‌ له‌داهاتودا له‌شه‌ڕ دوور ده‌كه‌وینه‌وه‌.))

ڤێرجینیا ئاماده‌یی خۆی ده‌ربڕی بۆ كۆمه‌ككردنی جونه‌یهی دووه‌م بۆ خه‌زنه‌داری كۆمه‌ڵه‌ له‌پێناوی دامه‌زراندنی (كچانێك كه‌ پرۆفیشناڵن) له‌و باره‌یه‌وه‌ ده‌ڵێ:

((ئه‌گه‌رچی ژنان توانای نه‌هێشتنی شه‌ڕكردنیان زۆره‌ به‌ڵام واقیع رێگه‌ نادات كه‌ له‌و روه‌یه‌وه‌ كارێك بكه‌ن, بوونه‌ پرۆفیشناڵ ئه‌و رایه‌ ئازاده‌ی له‌سه‌ر بنه‌مای داهاتێكی سه‌ربه‌خۆو وه‌كو چه‌كێك به‌كاربێنن, ئیتر ده‌توانن نه‌هێڵن شه‌ڕ رووبدات هه‌روه‌ها شه‌ڕی گه‌وره‌ش ده‌بێ له‌داهاتوودا هه‌ر له‌ڕێگه‌ی به‌كارهێنانی ئه‌و چه‌كه‌وه‌ روونه‌دات , بۆ ئه‌و ئامانجه‌ ڤێرجینیا كۆمه‌كی به‌جونه‌یهێك كرد , به‌ڵام كێشه‌ی ژنان ته‌نیا له‌ رێگه‌ی یاخی بونیانه‌وه‌ چاره‌سه‌ر ناكرێ و هه‌روه‌ها بۆ هه‌ڵوێستی پڕ گرێ كوێره‌ی ژیانی كچانی خوێنده‌واریش هه‌مان شته‌ .

(ڕژێمی باوكسالاری به‌دوامانه‌وه‌یه‌ , ڕژێمێك شكست خواردو و پڕلادان و هه‌موو خۆپه‌رستی و ئیره‌ییه‌كه‌وه‌ , ئه‌و جیهانه‌ی كه‌ وه‌كو كۆیله‌یه‌ك قۆڵبه‌ستمان ده‌كات و ئه‌و ماڵه‌ی كه‌ ناچارمان ده‌كات له‌بازنه‌یه‌كی باڵی په‌پوله‌دا بخولێنینه‌وه‌ به‌ده‌وری دره‌ختی توودا , ئه‌مه‌ش هه‌ڵبژاردنێكه‌ له‌نێوان دوو شه‌ڕدا))

ڤێرجینیا له‌سه‌ر كۆمه‌كی جونه‌یهی سێیه‌م ڕازی بوو به‌دامه‌زراندنی لیژنه‌ی ئاشتی , چونكه‌ بیركردنه‌وه‌ی ئه‌و وبیرو بۆچوونه‌كانی ئه‌و لیژنه‌یه‌ یه‌كیان ده‌گرته‌وه‌ , ئه‌مه‌ش له‌پێناوی روونه‌دانی جه‌نگ , پارێزگاری له‌مافه‌كانی تاك , به‌جێ به‌جێ كردنی ژیانێكی دیموكراسی و نموونه‌یی كه‌ ده‌خوازێ هه‌ل بدرێته‌ هه‌مووان , ئه‌وه‌ سه‌ره‌كیترین ئامرازه‌ وه‌كو ده‌ڵێن ((ئه‌وه‌ی كه‌ ئاشتی ته‌واو بۆ سه‌رتاسه‌ری دونیا به‌ده‌ست دێنێ)) به‌ڵام لێره‌شدا مه‌رجێك بۆ ئه‌و ره‌زامه‌ندییه‌ی خۆی داده‌نێ, ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌ پێویسته‌ شوناسی كه‌سێتی ژن تێكه‌ڵ به‌شوناسی پیاو نه‌كه‌ین, لای ئه‌و زه‌رووره‌ ژنان دووركه‌ونه‌وه‌ له‌كۆمه‌ڵه‌و رێكخستنه‌كانی





پیاوان زۆربه‌ی كات به‌هانه‌ بۆ داگیرساندنی ئاگری جه‌نگ به‌وه‌ دێننه‌وه‌ كه‌ناچارن بۆ پارێزگاریكردنی ژنان‌و پارێزگاری نیشتمانی دایكیان,ئه‌وه‌ بكه‌ن , به‌ڵام بۆچی ژنان پشتگیری سیستمێك ده‌كه‌ن كه‌وه‌كو كۆیله‌ مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵ ده‌كات, ئه‌و سیستمه‌ی كه‌پارێزگاری له‌دۆخی دواكه‌وتوویی و هه‌ژاری ژنان ده‌كات! ڤێرجینیا بیروبۆچونه‌كانی خۆی ده‌خاته‌ڕوو ده‌ڵێ:-

((له‌ڕاستیدا, وه‌كو ژنێك من نیشتمانم نیه‌, وه‌كو ژنێكیش نیشتمانم ناوێ, جیهان هه‌مووی نیشتمانمه‌)).

ڤێرجینیا به‌شه‌فافیه‌تێكی زۆره‌وه‌ له‌كتێبی (سێ جونه‌یهی) دا له‌مه‌ڕ دۆزی ژنان‌و رزگاربونیان ده‌دوێ, به‌ڵام ئه‌و شێوازه‌ ساكارو زیاد له‌پێویسته‌. له‌نرخی نوسینه‌كه‌ی كه‌مكردۆته‌وه‌, ئه‌و رۆمانه‌ زانیاری گرنگمان ده‌داتێ و به‌تونديش دژی چه‌وسانه‌وه‌ی ژنان به‌درێژایی سه‌ده‌كان ده‌وه‌ستێ, به‌ڵام ئه‌و گرنگیه‌ی كه‌به‌غه‌ریزه‌ شه‌ڕانگێزه‌كانی له‌ره‌گه‌زی نێرینه‌ دراوه‌, هیچ به‌ڵگه‌یه‌كی زانستی له‌پشته‌وه‌ نیه‌ ئه‌وه‌ش له‌میانه‌ی ئه‌و زانیاریانه‌ی كه‌له‌لێكۆڵینه‌وه‌كانی زانستی ده‌روونیه‌كان‌و مرۆڤدا, ده‌رده‌كه‌وێ, چونكه‌ مرۆڤ به‌بێ جیاوازی خۆی مه‌یلی بۆ كۆمه‌ڵێك ململانێی سروشتی ده‌چێت كه‌له‌توخمی جۆراوجۆر پێكهاتوون‌و تیایدا تێكه‌ڵێكه‌ له‌نێوان خێرو شه‌ڕ.

ناتوانین نكوڵی له‌وه‌ بكه‌ین كه‌ڤێرجینیا هه‌ڵوێستێكی توندی به‌رامبه‌ر هه‌ڵه‌كانی ره‌گه‌زی نێر له‌و كتێبه‌دا وه‌رگرتووه‌, ئه‌ویش بۆ كپكردنه‌وه‌ی په‌رۆشی خۆی به‌مه‌به‌ستی دروستبوونی رایه‌كی گشتی كه‌له‌به‌رژه‌وه‌ندی مافه‌كانی ژنان دا بێ.

ڤێرجینیا له‌نۆڤلیتی (ئۆرلاندۆ)دا, جیاوازی هه‌موو رۆڵه‌ كۆمه‌ڵایه‌تیه‌كانی ژن‌و پیاوی شیكردۆته‌وه‌و وه‌سفی داوه‌, ئه‌و پێی وایه‌ هه‌موو مرۆڤێك به‌شێوه‌یه‌كی رێژه‌یی جیا له‌یه‌كتری ڕاده‌یه‌ك سیفه‌تی (ئاوێته‌ی ره‌گه‌زیی)یان تێدایه‌.

لەگەڵ جیاوازیەکاندا هەردوو ڕەگەزەکە تێکەڵ دەبن, مرۆڤ لەڕەگەزەکەی خۆیەوە دەگۆڕێ بۆ ڕەگەزەکەی ترو لەهەندێ باردا یەکێکیان بەسەر ئەویتریاندا زاڵ دەبن, جلو بەرگیش تەنیا وەکو شتێکی ڕووکەش تەنیا شێوەی دەرەوەی جیاوازیەکانی نێرومێ دەردەخات, بەڵام ئەوە دەگۆڕێت لەناوەوەو بەپێچەوانەی تەواوی دەرەوەیە, ئەوە ڕەفتاری چاوەڕواننەکراوی ئۆرلاندۆ دەردەخات, کەلەناخدا ئاوێتەیەکی ژن و پیاوی تێدایە, وەکو ئەوەی سیفەتی یەکێکیان بەشێوەیەکی کت و پڕ زیاتر لەوەکەی تر دەربکەوێ.

مرۆڤ واهەست دەکات کە ئەم ڕۆمانە بۆیە نوسراوە تا ئەو تێگەیشتنە گشتیە کاڵ بکاتەوە کە دەڵێت :پیاو بەهێزو دووربینەو ژنیش لاوازو بەسۆزە.

لێرەدا ئۆرلاندۆ دەیەوێ تەواو نکوڵی لەبوونی جیاوازی ڕۆڵەکان لەنێوان کەسێتی نێرومێدا بکات, نوسەر نموونەی جیاجیا پێشکەش دەکات بۆ شیکردنەوەی سیفەتی ئاوێتەیی یاخود هەردوو ڕووە جیاوازە ڕەسەنەکەی مرۆڤ و وای دەبینێ کەهاوسەنگی نێوان ڕەگەزی نێرومێ لەکەسێکدا ئەوەیە کە دواجار هونەرمەندێك دروستبکات.

ڤێرجینیا دوای بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی تووشی ڕەخنەی جیاجیا بووەوە لەوانەش دەیانگوت, ڤێرجینیا لە (ژورێك تایبەت بۆ خۆمان)دا تەنیا قسە لەسەر توێژێکی دیاریکراوی ژنان دەکات, ئەوانەی کەئامادەییان هەیە ببن بەهونەرمەند, ژنان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ, زۆربەی کات وەك هونەرمەندێك درکیان بەو کۆسپانە کردووە کەلەبەردەمیاندا دەوەستن, کاتێ کە دەیانەوێ بوونی خۆیان لەبواری هونەردا بسەلمێنن.

هۆی ئەو بایەخدانە تایبەتیەی ئەو بۆ هونەر دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە بیرکردنەوەی لەو مەسەلەیەدا فرە ڕەهەند بووە, بۆ نموونە کەسایەتی وەك (مێری سیتۆن) لەو کتێبەیدا هونەرمەندێك نیە, هەروەها دایکی مێری و داپیرەشی, لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکی ژیانیان دەگێڕێتەوە, ئەو ئامانجی



سەرەکی دەرکەوتنی ڕاستیەکە کەباوەڕی پێی هەیە, بەدڵنیاییەوە دەبێ شێوازێکی فێربوون و سیستەمێکی نوێی کۆمەڵایەتی جیاواز هەبێ, بۆئەوەی زیرەکی ژنان و هێزی زەینی ژن گەشەبکات و کەسێتی لەکۆمەڵدا پەرەبسێنێ, ئەو خۆیشی هەڵوێستەکەی دروست بوو کاتێ کە بەتوندی ئەو سەیرکردنە باوەی ڕەتدەکردەوە کەژیانی ژن و پیاوی دەکرد بەدووجیهانی جیاواز ئەویش بە بەکارهێنانی دووپێوەری جیا لەیەکتر.

ژن مافی ئەوەی هەیە وەك مرۆڤو کەسێك بژی و پێویستە هەوڵیش بۆ ئەوە بدات, ئەوە کرۆکی مەسەلەکەیە کەلەکتێبی (ژورێك تایبەت بەخۆمان)دا پیشانمان دەدات .

هەروەها ناڕەزاییەکی تریش هەیە, ئەویش ئەوەیە کە زیاتر ئاماژە بەخۆشی و ناخۆشی ژنان لە چینی باڵاو مامناوەند دەدات, ئەوەش بێگومان ڕاستە, لە (سێ جونەیهە)دا بەتایبەتیش لەبارەی (کچی پیاوانی خوێندەوار) و ئاراستە بۆ ڕێگەی ڕزگاربونیان دەکات, پێناچێت بەئەنقەست ئەوەی کردبێ چونکە ئەو دووربوو لەژیانی خەڵك, بەگشتی و هەرگیز بانگەشەی زانینی لەو بابەتە نەکردووە کە خۆی زانیاری لەبارەیەوە نەبووبێ, ئەو وەکو هونەرمەندێك بەدوای ڕاستیدا دەگەڕاو لەمیانەی ئەوەی کە ئایا دەتوانێ لەژێرتیشکی ڕاستیەکی ڕۆشندا ببینێ گوزارشتی لەخۆی کردووە. بەڵام لەهەمان کاتدا مرۆڤ دوای خوێندنەوەی دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر ژنانی چینی ناوەڕاست و باڵا گەیشتنە ئەوەی باوەڕیان بەخۆیان بێ و درك بەهۆشیاریان بکەن, ئەوا ئەو باوەڕو هۆشیاریە بۆ تەواوی ژنانی چینەکانی تریش ڕەنگدەداتەوە, بەکردەوەش ئەو بیروباوەڕە لەمەڕ کێشەی ئافرەت لەنوسینەکانیدا دەبینین .

چالاکیەکانی ڤێرجینیا بەکردەوە لەسەر بزاڤی ئازادکردنی ژن لەژیانی تایبەتیدا دەردەکەوێ, بە بەشداریکردنی لە چالاکیەکانی کۆمەڵەی هاوکاری ژنان بەسەرکردایەتی (مارگرێت لیڤن)هەروەك چالاکیەکانی لەلقێکی ئەو کۆمەڵەیە بەناوی (ریگمۆند) لەساڵی 1916دا کۆکراوەتەوە هەروەهابەبەردەوامی سەرۆکایەتی کۆبونەوەکانی دەکردو ماڵی خۆی

ببوه سەنتەرو لانەیەك بۆ ئەم كۆبونەوانە, ئەو بەرپرسیاریەتی هەڵبژاردنی موحازەرەكان‌و ئەركی بەڕێوەبردنی كۆڕەكانی گرتبوە ئەستۆی خۆی‌و لەماوەی چوار ساڵدا رۆڵێكی كاریگەرو سەركەوتووی لەو كۆڕانەدا گێڕا, هەریەكێ لە((مورگان فۆستەر)) لەبارەی هیندستان‌و (پۆپ تریڤلاین) لەمەڕ چین‌و (مێری شیبشانكس) لەسەر پیرۆ دوان, ئەو موحازەرەو كۆڕانە زۆر بەنرخ‌و كاریگەربوون‌و ئامانجیان هوشیاربونەوەی ئەندامانی كۆمەڵەكە بوو لەمەسەلە سیاسی‌و كۆمەڵایەتیە هاوچەرخەكان.

بەو رێگایە ڤێرجینیا هەوڵی مەزنی بۆ پەروەردەیەكی دروست لەنێو كۆمەڵ دا ئەویش بەدانانی بنەمایەكی تیۆری نوێ بۆ بزوتنەوەی فێمێنزم. هەروەها هەوڵیدا بەشێوەی پراكتیكی فێركردن لەنێو ئەندامەكاندا بڵاوبكاتەوە, ئەم چالاكیانەشی بەڵگەن بۆ قایلبوونی بۆ كاركردنی ڕاستەوخۆی لەبزوتنەوەی ژناندا. سەرەڕای ئەوەی توانی لە كەشی داخراوو سەركوتكراوی سەردەمی ڤیكتۆریدا جیاببێتەوە, بەڵام ئەو بەتەواوی نەیتوانی سەركەوتووبێ بەرانبەر ئەو هێزە خواروخێچەی ئەو سەردەمە, ئەمەش بەرسڤێكی ئاسایی بوو چونكە سەردەمی ژیانی ئەوكۆمەڵگاكەی لەقۆناغێكی كۆمەڵایەتی ناجێگیردا دەژیا.

ئامانج‌و نموونەكان یەكن‌و بەتێپەڕبوونی سەردەمەكان ناگۆڕێن. بەڵام ئامرازەكان بەپێی تێپەڕبوونی كات جیاوازن, لەوكاتەدا شێوازی ڤێرجینیا جیاوازبووە, بەڵام هەمیشە هاودەمێكی دڵسۆزبووە بۆ مافەكانی ژنان , لە ناخیەوە بڕوای تەواوی بەیەكسانی نێوان ژن‌و پیاو هەبووە. وتوانیویەتی لەمیانەی گفتوگۆو وتوێژەكانیدا بەزمانێكی كاریگەرو بەهێز باس لەئازادبوونی ژن بكات, ئەمەش كاری بۆ ئاسان كردووە كەبتوانێ هەنگاو بەرەو خەبات‌و تێكۆشان لەپێناو ئازادیدا, بنێت.



## تێبینی‌و سەرچاوەكان

1- ئا.م, فوستەر ,ڤێرجینیا وۆلف, (Rede) كامبریدج,1945 .

2- بۆ زانیاری (Q.Bell) موحازەرەكان, ڤێرجینیا وۆلف ,ژیاننامە, لەبارەی ژیانی ڤێرجینا: بەرگ یان 2 سەرچاوە (مشتومڕ) فەلسەفەی (j.k.johnston)بلوفربیری, (گروپی بلوفربیری ) نیۆیۆرك , (1954) حەسنە بیحوم ,زانیاری رەوشتی ل(Moores Etenice)جۆن ستۆن . بیردۆزە و پراكتیك , زانكۆی دەككا , دەككا (1982) .

3- (ژورێك تایبەت بە خۆمان ) (Panl ther) 1977,لاپەرە (5) بەراوێز چاپی میللی كنێبی

4- ڤانـدایك وێنـەكێش بـوو لـەكاتی شـەری یەكـەمی جیهـانی , (46) وێنەی شاری كێشاوە، هەندێ لەرەخنەگران دەڵێن كە دەرباری مەلیكی ئینگلتەرا بووە .

5- هەمان سەرچاوە لاپەرە 12

6- هەمان سەرچاوە لاپەرە 22.

7- هەمان سەرچاوە لاپەرە 23.

8- هەمان سەرچاوە لاپەرە 23.

9- هەمان سەرچاوە لاپەرە 27.

10- هەمان سەرچاوە لاپەرە 33.

11- هەمان سەرچاوە لاپەرە 34.

12- هەمان سەرچاوە لاپەرە 35, 36.

13- (سێ جونەیهی) چابخانەی (Hogarth) , لەندەن , 1928 . هۆگارت,

14- هەمان سەرچاوە لاپەرە 15, 16.

15- هەمان سەرچاوە لاپەرە 13.
16- هەمان سەرچاوە لاپەرە 135.
17- هەمان سەرچاوە لاپەرە 182, 185.
18- هەمان سەرچاوە لاپەرە 197.
19- ,(Moinaue Nathan),ڤێرجینیا ۆلف , اف داگرین لە کتێبی ,
1961,(Everg reen booka Ltd)





# بەشی هەشتەم
## سیستمی بەشی ڕێژەیی دامەزراندن لەبەنگلادیش
## ( پرەنسیپە مۆراڵەکان )

لەمێژووی قۆناغەکانی مرۆڤایەتیدا جیاکاری چەمکێکی گشتی و باوە کەبە هـۆی ڕەگـەز، یاجیـاوازی چـینایەتی ، ئایینـە جیـاوازە کـان کـە سەرەرای تێپەڕبوونی سەردەمەکان هەندێکی وەکو خۆیان ماونەتەوە.

بەم دواییانە نەتەوەیەکگرتوەکان هـەنگاوێگی بوێرانەو واقیعیانەی نا بۆڕووبەروبونــەوەو چارەســەرکردنی شــێوە جیاوازەکــانی جیاکــاری ، ئــەویش بانگــەوازی مــافی یەکســانبونە ,هــەروەها لــە ســونگەی دادپەروەریــەوە بیرۆکــەی (قەرەبوکردنــەوە لــە جیاکــاری)هەیــە ئــەویش بۆنەهێشـتنی ئاسـەواری هەرجیاکاریـەك کەلـەڕابردودا ڕویـدا بێـت، یـان ئەوانەی تائێستا لەسەر بنەمای خێڵ و ئایین و ڕەگەز ...هتد ڕووبەڕووی جیاکاری دەبنەوە. شێوازێکی تەواوکۆك یان نمونەیی لەڕووی ئاکارەوە لەمـەر جیاکـاری نیـە.تـەنیا ئـەوە نـەبێ کـەدانی مافـەکان بەیەکسـانی و ڕەنگدانەوەی کاریگەری دەبێ لە سەر ئێستاو داهاتووش .

بـەپێوەری دادپـەروەری قەرەبووکردنـەوەی ئـەو زیانـە بەهـەنگاوێکی پێویست دادەنرێت، کەواتـە چـی بکـەین بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەم پێوانەیـەدا بڕۆین؟

وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بـەم شـێوەیە دێ کـەدەبێ پـەیڕەوی سیاسـەتی (قەرەبوکردنەوە لە جیاکاری ڕابردوودا) بکەین(1). دانانی ئەو سیاسەتە تەنیا بۆ بەخشینی یەکسانبونی مافەکان نیە بەڵکو پێویستە زیاترو زیاتر لەم مافانە لەڕووی چۆنیەتی وچەندێتی لەئێستاو داهاتوودا بدرێت، هەتا دەگاتە قۆناغی سڕینەوەی ئەو زیانانەی کە بەهۆی جیاکاری کەوتۆتەوە

**لەڕابردوودا. ئەمە ناوەڕۆکی سەرەکی تیۆری قەرەبووکردنەوەی جیاکاریە لەڕابروودا. ((نظرية التعويض عن التمين)).**

-1-

## ئێستا پرسیار ئەوەیە مەبەستی تەواو لەبیرۆکەی ( قەرەبوکردنەوەی جیاکاری ) چیە؟

**پێش ئەوەی ئەو گوزارشتە (قەرەبوکردنەوەی جیاکاری) شی بکەینەوە دەبێ وشەی جیاکاری ڕاڤە بکەین، مەبەست لەجیا کاری پەسەند کردنی یەکێکە بەسەر یەکێکی تردا، یاخود گواستنەوەی کۆمەڵێك بەرژەوەندی کەسێك بۆ کەسێکی تر، یان بەرژەوەندی کۆمەڵێك بۆکۆمەڵێکی تر، مرۆڤ خۆی دان بەوجیاوازیانەی نێوان مرۆڤەکان دادەنێ، ئینجا چ جیاوازی ئایینی یانەتەوەیی یاخێڵەکی بێت ، یاخود لە نێوان دوو ڕەگەز , جیاکاری لە نێوان خودی مرۆڤەکان پیادەدەکرێت، بەلاّم ئەم تێگەیشتنە بۆ بیرۆکەی جیاکاری تەواو جودایە لەوانی تر، سەرەڕای ئەوەی ناوەرۆکێکی مۆراڵی لەوتێگەیشنەدا دەبینین، کاتێك کەدەبێتە بەشێك یان سیاسەتی بەشێك لە جیاکاری پیادە دەکات ، بۆ بنەمای یەکسانی نێوان مرۆڤەکان بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی نەتەوە یا ڕەگەز یان مەزهەب، پرنسیپێکی ئەخلاّقیە و هەروەها سیمای ووشەی جیاکاری هەندێ لەو مانایە بۆدەرکردنی حوکمێك کەپشت بەو پرەنسیبە ئەخلاّقیە ببەستێت, لەخۆدەگرێت . بەگشتی ئامانجی ئەو گفتوگۆیە دیاریکردنی ئەو هۆکارانەیە کەپاساوێکن بۆ جارێکی تر سەپاندن و مانەوەی جیاکاری لەسەربنەمای ڕەگەز.**

**دوای ئەو شیکردنەوە خێرایە بۆ تێگەیشتن لە قەرەبوکردنەوەی جیاکاریکە لەڕابردوودا پیادە کراوە، ئەو نموونە دێنینەوە:**

**ئەگەرنموونەی ا وب وەرگرین کە پێشتر (ا) توشی جیاکاری بۆتەوە بۆبەرژەوەندی (ب) کە وا بێ پرۆسەی سەپاندنی هەمان جیاکاری بەسەر**



**(ب) لە ڕێگەی هێزەوە بۆ بەرژەوەندی (أ) دووبارە جیاکاری کەلە زیانی (ب) یە ڕوودەدات کرداری ئەو دوبارەبونەوەی جیاکاریە پێی دەوترێت جیاکاری ئێرتیدادی یان (( قەرەبوکردنەوەلە جیاکاری ڕابردوو)) تەنانەت لە سەرەتاکانی ئەم توێژینەوەیەدا دەبینین،کە ئەم گوزارشتە لەناوەڕۆکە ئاکارەکەیدا دوو ڕوی لەیەك جیای هەیە لایەنێکی پۆزەتیڤ و لایەنێکی نێگەتیڤ، لایەنە پۆزەتیڤەکەی قوربانیەکانی جیاکاری لە ڕابردوو, دووبەرابەرمافەکانیان پێ دەبەخشرێتەوە بۆ ئەوەی بەرەوپێشەوە هەنگاوبنێین وسەرکەون بەسەر ئەو دواکەوتوویانەدا کە لەئەنجامی جیاکاری لەڕابردوودا تووشیان بووە، لێرەدا ئامانج نابێتە مەسەلەی کەم کردنەوەو پێشێلکردنی بەرژەوەندی ئەوانی تر, بەلاّم ڕەنگە هەندێ ئاسەواری نەگەتیڤ و خراپ بەرانبەر هەندێ کەسان بێنێتە ئاراوە، ئەمەشە لایەنی خراپی ناوەڕۆکی ئەم قەرەبووکردنەوە، واتە لایەنە خراپەکەی ئەوەیە کە مافی زۆرتر لە ئاستی یەکسان بوون گەڕانەوەی مافە پێشێلکراوەکان, بدرێت، واتە(( دوای کەمکردنەوەی مافەکانی ئەوانەی کە بوون بەهۆی زەرەرو زیان لەبەرژەوەندی و مافی ئەوانی تربە هۆی بوونی جیاکاریەوە))**

**ئەم بارە لە سیستمی کۆتا بۆ ژنان لەکاتی دامەزراندنیان جێ بەجێ دەکرێت. پرسیاریش ئێستا ئەوەیە :(( ئایا جێ بەجێ کردنی ئەم سیستمە بە تۆڵە سەندنەوە دانانرێ؟ وەلاّمیش، بێ گومان نەخێرە، چونکە ئەگەر مەسەلەی بیری تۆڵە کردنەوەمان بەهەند وەرگرت ئەوا مەسەلەی پرەنسیپە مۆراڵەکان وون دەبن، بۆیە ئەو پرەنسیپانە لەئێستادا گۆڕانیان بەسەر دادێت و شێوەی نوێترو مرۆڤانە تر وەردەگرن. هەروەها بوار بۆ دواکەوتن و گەڕانەوە بۆ دوواوە ناهێڵن.**

**ئەگەر پێشکەوتنی مۆراڵیەکانی مرۆڤایەتی بەهەند وەربگریت ئەوا پاساو بۆ ئەم سیاسەتە بەم شێوەیە دێنینەوە، تاکە هەولێکی میتۆدیە کەوا لە گروپەکانی کەسە بێبەشکراوەکان دەکات،لە هەمان پلە یان ( ئاست )ی مرۆڤەکانی تردا بن لە کەمترین و کورترین ماوەدا**

هەروەها پارێزگاری لە مافە زێدەکان چانسی زیاتر دەدات بۆ پێشکەوتنی ئەو گروپە جۆراوجۆرانەی کە پێشوتر بەدرێژایی قۆناغەکانی مرۆڤایەتی جیاکارییان لە بەرانبەردا کراوە.

-2 -

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە دۆزینەوەی پاساوەکانە بۆ سیاسەتی (قەرەبووکردنەوەی جیاکاری) کە لە سیستمی ڕێژەیی (دیاریکردنی کۆتابۆ ژنان) لە دامەزراندنیاندا دەردەکەوێ, ئەم داواکاریەش لەلایەن زۆربەی ڕێکخراوەکانی ژنانی بەنگلادیشەوە بوو,وەك وەڵامدانەوەیەك حکومەت بڕیاری دانانی 15٪ ی بۆدامەزراندنی ژنان بەگشتی دەرکرد, ڕەزامەندی حکومەتیش لە 4 ئەپریلی 1976 بوو بۆدامەزراندنی ژنانی کرێکارلە دامو دەزگاکانی حکومەت بە ڕێژەی لە 10٪ .

ئەم سیاسەتە ڕوو بەڕووی کۆمەڵێك ڕەخنە بۆوە لەبەر ئەوەی سیاسەتێکە شێوازی فەرز کردن لەوەزیفەدا پەیڕەو دەکات، هەروەك گفتۆگۆو مشتومڕێکی زۆر لەسەر ئەم سیاسەتە کرا کە هەندێ لەبەرژەوەندی و هەندێکیش لە دژی بوون . ئەو ڕەخنانەی کەبلاوبون ئەم پرسیارەیان دەکرد: بۆچی ژنان مافی زیاتریان دەست کەوێ، لەکاتێکدا خۆیان داوای یەکسانی بوونیان دەکەن؟.... هەروەها ڕەخنە گرە توند ڕەوەکان دەیان ووت: ئەگەر ژنان سیاسەتێك لەسەر بنەمای مافی زیاتر پەسەند بکەن ئەوا لۆژیك وایە کە واز لە دروشمی (مافەکانی یەکسان بوونی ژنان) بێنن، بۆیە ڕەخنەگرانی ئەم داواکاریانە دژ بەیەکبوون، لەکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا هەڵسەنگاندنێکی تەواو بۆئەو ڕەخنانە دەکەین کە قەرەبووکردنەوە تاوانبار دەکەن .

لەگەڵ ئەوەشدا لەم قۆناغەدا پێویستمان بەچاو خشاندنێکی زیاتر بابەتی و واقیعیانەیە، چونکە ناکرێ ئەو باوەڕەمان پێ واقیعی و ڕاست بێ ئەو ڕێنماییانەی دەرچوون بۆ دانانی لە (15٪) ی وەزیفەکانی حکومەت بۆ ژنان، بەکت و پڕی ببێتەمایەی نەمانی چەوساندنەوە



کۆمەڵایەتیەکان و نەهێشتنی جیاکاری دژی ژنان , وەکو ئەوەی جووڵەی گۆپاڵی سیحری بێ و هەموو ڕابردوو بسڕێتەوە.

ڕاستیەکەی ئەوەیە تا دەرچوونی ئەو ڕێنمایانەش ، کارێکی سەختە بۆئەو ژنانەی هەمان توانایان پیاوانیان هەیە و بتوانن بە ئاسانی کار بدۆزنەوە (بەتایبەتیش لە وەزیفە باڵاکاندا) هەروەها تێبینی ئەوەش دەکەین کە گرانە دوای دەرچوونی ئەو بڕیارەی حکومەت لە مەڕ جیاکاری , بواری ئەوە هەبێ ڕاستەوخۆ باس لە جیاکاری بکەین بۆیە دەبینین کۆمەڵ بەوە خۆی ناچار دەبێ هەڵوێستی خۆی لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بگۆڕێت،ولە دەرەنجامدا ئەوەش دەبێتە هاندەرێك بۆ ژنان بۆزیاتر کارکردنیان لە ژێر ئەو بارە نوێیەدا.

-3-

لەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنیا قسە لەسەر مانا مۆراڵەکەی زاراوەی (جیاکاری) دەکەین هەروەك هەوڵی سەلماندنی ئەوە دەدەین کە ئایا (جێبەجێ کردنی تێزی قەرەبووکردنەوەی جیاکاری لە ڕووی لۆژیکەوە لەگەڵ لایەنە پراکتیکیەکەی هاوتایە، بە تایبەتیش (پەسەندکردنی دامەزراندنی ژنان لەژێر ناوی (قەرەبووکردنەوەی جیاکاری لەسەر بنەمای ڕەگەز).

لەم قۆناغەدا ئەوەی پێویستە لە ((سیستمی کۆتا )) کە ئامادەکراوە بۆ پەسەندکردنی دامەزراندنی ژنان (3) (واتە بەخشینی سوودمەندبوون)(4) لەسەر بنەمای جیاوازی ڕەگەزی, دیاری کردنی کۆتا لەسەر ئاستی ژمارەی ژنان لە کۆی گشتی دانیشتوانی وولاتدا ناوەستێ، (چونکە ئەگەر وابێ بەشەکە دەگاتە لە(50٪)) بەڵکولەسەر ژمارەی ژنانی پێشکەوتوولە وەزیفە خوێندەواروخاوەنی شارەزا ئەوانەی لێوە شاوەن بۆ ئەو ئەرکەی کە پیاندەدرێ بەوەش ژمارەی ئەو ژنانە وەردەگرین کە لەگەڵ ئاستی ڕێژەدانراوە کە دایە و ڕێژەکەش بەنزیکراوەیی ئێستا لە بەنگلادیش لە (15٪) یان. واتە لە هەر (100) ژنێك (15) یان بەمەبەستی دامەزراندن ئاسانکاریان بۆ دەکرێ و،

بێگومـان لەمیانـەی ئـەو کێبڕکـێ ئـازادەی کـە لەوەزیفـەدا هەیـە مـافی پێشـکەوتن و گەیشـتنی وەزیفـەکان بۆژنـانی دیکـەش کەلـەدەرەوەی ئـەو ڕێژەیـەدان  واتـە لـە 15٪ نـاتوانین ئـەوە بڵـێین کـە ژنـان هـیچ کاتێـك لـەو ململانێیانەدا سەرکەوتوو نابن، چونکە کۆتا لەبەنگلادیش لاوازەو بەهێز نیە ، لەبەر ئەوەی بە گوێرەی ژمارەی ژنان لە کۆی گشتی دانیشتواندا دانەنراوە، تەنها لە (15٪) ی وەزیفەکان بۆژنانن لە کۆی ڕێژەیی تەواوی ژن لە کۆمەڵدا کە لە (50٪) زۆرترن ، بۆیە پێویست دەکات لە (15٪) ی ژنـان لـە هـەموو دەزگـاو ئەنجومـەن و ڕێکخراوێـك دابمـەزرێن و هـەروەها ڕێگـەیان پـێ بـدرێ لـە وەزیفـە بەرزەکانـدا دابمـەزرێن ، لـە کـاتی پێشکەوتنیان لە پیشەکەی خۆیاندا.

با ئێستا گفتۆگۆ لەسـەر مانـای (جیاکـاری رەگـەزی) بکـەین، بەهۆی کاریگـەری پراکتیکـی جیاکـاری لـە ڕابـردوو ئێستاشـدا,بڕیـارو ڕێنمـایی تایبەت بەجێبەجێ کردنـی سیسـتمی کۆتـا دەرچـوو بۆ ژنـان جیاوازی لـە جـێ بـەجێ کردنـی سیسـتمی کۆتـا کـە ئامـانجی لـەناوبردنی کاریگـەری خراپەکـە لـە دەرئـەنجامی ئـەوەوە تـا ئێسـتاش بـەهۆی جیاکاریـەوە ماوەتـەوە. کەواتـە (جیاکـاری ڕەگـەزی) مانـای چـی یـە؟ لەبنەڕەتـدا واتـای ((سیسـتمێکی نابەرابـەر بـۆ جیاکـاری کـردن لەسـەر بنـەمای جیاوازی‌یـە بایەلۆژیەکانی نێوان ژن و پیاو)).

لەبنەڕەتـدا جیاکـاری فـۆکس دەخاتـە سـەر ڕەگـەزی ئـەو کەسـەی کـە سـتەمی لێکـراوە, لـەو حاڵەتەشـدا تـەنیا رووخسـاری گشـتی بەهەنـد وەردەگیرێـت یـاخود ئـەو سـیفەتانەی کـە ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدیان بـەو کەسەوەیە کە سـەر بە ڕەگـەزێکی دیـاری کـراوە (نێریـان مـێ)  هـیچ جـۆرە جیاوازی‌یـەکی ناڕاسـتەوخۆ بەهەنـد وەرناگیرێـت، بـۆ نموونـە چـەند سـیفەتێکی جەسـتەیی و هـزری تایبـەت لـە ژنانـدا هـەن بـەڵام تـەنیا دەگوترێـت ژنـان لـەڕووی جەسـتەییەوە لاوازتـرن و ژن باشـتر چـاودێری منداڵەکان دەکات و هەروەها ژنان بەسۆزترن وەکو سیفەتێکی سروشتی خۆیان.





باسکردنی ئەم سیفەتانە بە ئاشکرایی  (جیاکاریەکی بنەڕەتیـە)کە لـە زۆربـەی جـاردا ڕوودەدات، جیاکـاری بنەڕەتیـە لـەکارکردن دا بەشـێوەیەك دەبـێ کـە کەسـێکی لێهـاتوو دەبێتـە قوربـانی بـەهۆی سـنووردارکردنی تواناکانی وەکو ژنێك یان بەهۆی هەر سیفەتێکی تری کەتایبەتە بە ژنان. بەم جۆرەش دەگوترێت (جیاکاری بنـەڕەتی) واتـە کـاتێ کەسێك تووشـی جیاکاری دەبێتەوە تەنیا لەبەر ئەوەی ئینتمای دەگەڕێتـەوە بۆ ڕەگـەزێکی دیاری کراو کە سیفەت و ئاکاری تایبەتی و ڕەسەنی خۆی هەیە.

لێرەدا دیسانەوە جیاکاریەکی  دیکە هەیە ئەویش (جیاکاری لاوەکی) واتـە ئـەم جۆرەیـان تـەنیا لەسـەر بنـەمای ئینتمـابوون بـۆ ڕەگـەزێك یـا کۆمـەڵێکی دیـاریکراو نییـە، بـەڵکو ئـەم جیاکاریـە جـەخت لەسـەر ئـەو جیاوازیانـە دەکاتەوەکـە لەدەرئـەنجامی دۆخـە کۆمەڵایەتیـەکانی ژنـان و پیاوان کەوتۆتەوە. بۆ نموونە ژنان لە رووی داراییەوە پشت بەمێرد، یان پیـاوێکی خانـەوادەی خۆیـان دەبەسـتن (لـە سیسـتمی کۆمـەڵێ ئێسـتادا) پێویستە لەسەر پیاو کە هەموو بەرپرسیارێتی دارایی تایبەت بە خێزان هـەڵبگرێت، لەبـەر ئـەوە زیـاتر دامەزراندنی پیاوان باشترە لـەنێو هـەردوو رەگەزەکەدا. ئەمە جیاکاری لاوەکیە، لێرەدا کاریگەریەکی ڕاستەوخۆ لـە دامەزرانـدن لەسـەر بنـەمای ئینتمـا بـۆ ڕەگـەزێکی دیـاری کراونیـە، بـەڵام زێدەڕۆیی نیە ئەگەر بڵێین ئەم شێوە جیاکاری‌یە لەباوەڕبوون بە جیاکاری بنەڕەتی هەڵدەقوڵێت. ئەوانەی ئەم بیروباوەڕیـان هەیـە بیریـان دەچێت کـە هـەل بـە ژنـان نادرێـت بـۆ ئـەوەی بەرپرسیارێتی ئابووری خۆیـان یـاخود خانەوادەکەیان هەڵبگرن (بۆ نموونـە هـەڵی دەستکەوتنی کاڵای ئابووریـان بدرێتێ) چون سیستمە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنـەمای جیاکـاری رەگـەزی دامـەزراوە، و پیـاوان لـە پشـت دەمـامکی لیبرالیـدا هەلوێستەکانی خۆیـان دەشارنەوە کە دەلالەتە لە (جیاکاری بنەڕەتی) بەڵام لە بـەرگێکی لاوەکیـدا دەریدەخەن(5).

با ئێستا بیر لە مانای (دامەزراندنی پەسـەندکراو) بکەینـەوە، بەگشـتی فەرمانبەران لەسەر بنەمای پەسەندکردن هەڵ دەبژێردرێت، مرۆڤ ناتوانێ

بە تەواوی بابەتیانە بێ. بە تایبەتی لە کاتی هەڵبژاردن لە نێوان تاکەکان دا. ڕەنگە هەندێ جار ئەندامانی لیژنەی تاقی کردنەوە هاوڕابن، بەڵام ڕەنگە هەندێ لەو ئەندامانە دیسانەوە بیر لەو شتە بکەنەوە، یا ڕەنگە هەندێ لە ئەندامانی ژنان لەو لیژنەیەدا لەبەر چەند هۆکارێکی پراکتیکی ڕایەکانی خۆیان نەڵێن. لێرەدا لەم لێکۆلینەوەماندا بیرۆکەی (دامەزراندنی پەسەندکراو) بە مانای تەواوی وشە دیاریکراوەکە بەکار دەهێنین نەك بەمانا فراوانەکەی، لێرەدا پەسەند کردنەکە سەبارەت بەو جیاکاریە کە لە کاتی هەڵبژاردنی پیشکەوتووانێکدا کە پلەی لێهاتووییان وەك یەکە ، بە ڕەچاوکردنی بنەما یان بیرۆکەیەکی دیاری کراو، دەربڕینی (دامەزراندنی پەسەندکراو) لە دامەزراندنی کەسەکان لەسەر بنەمای بەشی دیاریکراو(بنەمای ڕێژە) یان لەسەر بنەمای ڕەگەز یان دامەزراندنی کەسەکانی بەشێوەیەکی تایبەتی دەبێ.

-4-

چوار پاساوی سەرەکی لەبەرژەوەندی گۆشکردنی پرەنسیبی (دامەزراندنی پەسەندکراو) بۆ ژنان لەسەر بنەمای تێوری جیاکاری قەرەبووکراون پێشکەش دەکەین، یەکەمیان ناودەنێن پاساوی (دادپەروەری لە قەرەبووکردنەوەدا) و دووەمیشیان (پاساوی کاریگەر بە ڕۆڵە نموونەییەکان) و سێیەم (پاساوی سوودمەندی کۆمەلایەتی) چوارەمو دواییینیان (پاساوی تەواو یان کامڵ بوون).

لە پاساوی دادپەروەری لە قەرەبووکردنەوە دا، دەبینین کە دامەزراندنی پەسەندکردنی ژنان بەهانەیەکی ئەخلاقیە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو ژنانەی کە لە ئەنجامی زوڵمدا بێ بەش بوون لە ڕابردوو و ئێستاشدا، ڕەنگە هەندێك بپرسن لەبنەمادا قەرەبووکردنەوە بۆچی بکرێت؟ بەم شێوەیە وەلامی ئەو پرسیارە دەدەینەوەو دەڵێن: هەمووان جگە لەوانەی کە ناهۆشیارن لە ڕووی ئاوەزەوە پێویستە لەسەریان هەست بە گرنگی پرۆسەی قەرەبووکردنەوە بکەن،لێرەدا ئیتر لەمشت ومڕی ئەوانە رادەوەستین، چونکە ئەوە ئامانجمان نییە.





لەگەڵ ئەوەشدا پرسیاری سەرەکی و گرنگتر لەبارەی دادوەری قەرەبووکردنەوە ئەوەنیە (بۆچی قەرەبووکردنەوە هەبێت؟) بەڵکو ئەوەیە (کێ قەرەبوودەداتەوە؟ چونکە ئەو نەوەیەی کە لەڕابردوودا زەرەری گەیاندوە و ئەو سیستەمی جیاکاریەی لەسەر خەڵك پیادە کردووە بەگشتی نەماوە و نەوەیەکی تر جێگەی گرتۆتەوە، کەواتە ئایا دەکرێ ئەو نەوە نوێیە خەوشە ئەخلاقیەکانی کە نەوەی پێش خۆی بەجێی هێشتووە لەئەستۆ بگرێ؟ ئەگەر ژنان لەسەر بنەمای تێوری قەرەبووکردنەوە لە وەزیفە جیاجیاکاندا دابمەزرێن. دادپەروەری قەرەبووکردنەوە دێتەدی، بەلام کێ قەرەبووی ئەو پیاوانە (نەوەی نوێ) لەو زەرەرەی کە بۆ ئەم قەرەبووکردنەوەیە داویەتی, دەکاتەوە؟

پێ دەچێ لێرەدا پاساوی دادپەروەری لە قەرەبووکردنەوەدا هەندێ لایەنی خراپ لەخۆ بگرێ ,بۆ نموونە:(پاشگەز بوونەوە) و رەنگەچارەیەك بۆ ئەم کێشەیە نەبێ. ئەگەر دامانناا قەرەبووکردنەوە بۆ زەرەری ئاکاریەکان بێت، ڕەنگە بپرسین کێ لەسەریەتی قەرەبووکردنەوەکە بدات؟ بۆ نموونە لەوولاتێك یان لە وولاتان حکومەت و دەوڵەت بەرپرسیاریەتی تەواو هەلْ دەگرێ، کاتێ کە سیستمی بەشی ڕێژەیی داخلْ دەکرێ( 6)، بەلام دەوڵەت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەناو بەرپرسیاریەتی ئەو کەس‌و لایەنەنانەیە کە قەرەبووکردنەوە دەیان گرێتەوە (لەو حاڵەتە دا واتە پیاوان) دەگوازێتەوە.

بۆ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە نموونەیەکی کورت پێشکەش دەکەین: (ڕەحیم دوای ئەوەی پاسکیلێکی لە کەریم دزی، دەیدایە یان فرۆشتی بە عەبدوڵلا، عەبدوڵلاش نازانێ کە ئەم پاسکیلە دزراوە بەلام دوای ئەوە ڕاستیەکە دەزانێ. کە واتە لێرەدا لەسەریەتی وەکو پابەندبوونێکی ئەخلاقی ئەم پاسکیلە دزراوە بداتەوە بە کەریم. لەگەڵ ئەوەی کەخۆشی نەیدزیووە. ئەگەر بەچاوی (دادپەروەری لەقەرەبووکردنەوە) دا سەیری ئەم نموونەیەمان کرد هەڵوێستەکەمان بەم شێوەیە دەبێ.

پیاوان لەڕابردوودا ژنانیان لەکارکردن بێبەش کردووە. دەرەنجامی ئەوەش، ژنان نەگەیشتوون بەو پێگەیەی کە ئامادەیان دەکات بۆ کارکردن و پیاوانیش سوودیان لەو جیاکاریە وەرگرتووە بۆ وەرگرتنی دەسەڵاتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان لەنێوخێزان و کۆمەڵگەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا بەرپرسیاریەتی ئەخلاقی دەکەوێتە ئەستۆی نەوەی ئێستا، دوای ئەوەی کە تێگەیشتن لە ڕابردوودا پیاوان ستەمیان بەرانبەر بە ژنان کردووە.

لەو ڕوانگەیەوە دەتوانین قەبووڵی تیۆری دادپەروەری لە قەرەبووکردنەوەدا و دامەزراندنی لە شێوەی پەسەندکردن بۆ ژنان بکەن. بەڵام هەندێ پرسیار خۆیان دەسەپێنن, یەکەم پرسیار: بۆچی ئێستا قەرەبووی ئەو کەسانە دەدەینەوە کە لە ڕابردوودا دەستیان لە هیچ زیانێکدا نەبووە؟و بەڵکو بە کێشەی بێ بەشبوون ناڵاندوویانە. دووەم شت : ئەوانەی ئێستا قەرەبوودەکرێن هیچیان لەڕابردوودا بەهەدەر نەڕۆیشتووە، کەوابێ چۆن شیکردنەویەکی دروست و گونجاو بۆ ئەم بارە لەژێر ڕۆشنایی تیۆری دادپەروەری (قەرەبووکردنەوەدا) بکەین؟ وەك وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە دەڵێین: مادام ئەرك و مافەکان و بەرپرسیاریەتی لەنەوەیەکەوە وەکو میرات بۆ نەوەیەکی تر دەمێنێتەوە، کەواتە دەکرێ بەرپرسیارێتی و ئەرکەکان کە لە کەموکوڕی و کەمتەرخەمی ئەخلاقی لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بگوازرێتەوە، هیچ لۆژیکێك بۆ تێگەیشتنە مرۆڤایەتیەکان نامێنێتەوە، ئەگەر دان بەبوونی بەر پرسیارییەتی ئەخلاقی بۆ ماوەیی دانەنێن.

پرسیاری دووەم / چ شتێك بەڵگەیە کە دامەزراندن لەسەر بنەمای پەسەندکردن ئامرازێکی گرنگە بۆ قەرەبووکردنەوە؟ ئەوەندەی دەتوانرێ بگوترێ. لە کاتێك دا ئەوان بە ڕاستەوخۆو بەشێوەی نا ڕاستەوخۆ بەشدارنەبوون لە ڕووداننی ئەم زوڵمە لە ڕابردوودا. پێویستە لێرەدا ئەوە زیاد بکەین کە ئەوان بەبێ بەشداربوون سوودیان وەرگرتووە، نەك بەشێوەی ڕاستەوخۆ ئێستا لەسەریانە قەبووڵی هەندێ زیان بکەن. کە



ئەمە کەمترین قوربانیە بیدەن لە ڕووی ئەخلاقیەوە، ئەگەر نەمان توانی قەرەبوو بەم ڕێگایە بکەینەوە ئەوا دۆزینەوەی ڕێگایەکی تر مەحاڵە بۆ قەرەبووکردنەوە(7). باوەڕبوون بە بە بەردەوامیەتی بەرپرسیاریەتی لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر پەیوەستە بە تیۆری بەهانەی دادپەروەری (لە قەرەبووکردنەوەدا). و هەر کاتێك ئەم باوەڕە نەما ئەم تیۆرەش نامێنێ.

پرسیاری سێیەم / ئەو پەیوەندیە لۆژیکیەی نێوان داخوازی ئێستا بۆ زیاتری مافەکان و جیاکاری لە ڕابردوودا چیە؟ لێرەدا هۆیەکی تایبەت هەیە لەبواری دامەزراندن و هەل ڕەخساندن بۆ گەیشتن بە بۆ کارکردن، پێ دەچێ بەهانەی ڕاستەقینە لەپشتی سیاسەتی قەرەبووکردنەوە لە جیاکاریدا بەم شێوەیە بێ: ئەگەر ژنان بەشێوەی ڕێژەیی (بەدامەزراندنی پەسەندکراو) دانەمەزرێن لە ڕیزەکانی پشتەوە دەمێننەوە لە کێبڕکێدا. بەمەش پیاوانی کێبڕکێ کار بەخێراییەکی زیاتر بۆ پێشەوە دەڕۆن لەئەنجامدا تێکڕای دواکەتوویی ژنان بەخێرایی زیاددەکات وەکو یەك بەدواییەکی ئەندازەیی (المتوالیة الهندسیة) وهەلی پێشکەوتنیان لەدەست دەڕوات وبە بێئومێدی دەکەونە پەراوێزی تاریکەوە. بەم حاڵەش جێ بەجێ کردنی قەرەبووکردنەوە لە جیاکاری بۆ ئەو بوونەوەرە غەمگینانە هیچ سوودێکی نابێ. لە بنەڕەتدا ئامانج و داخوازی جێبەجێ کردن لەو قەرەبووکردنە وەیەی کە لەبواری کارکردن دا ژنان پەسەندتر دەکات، بۆ پاراستنیەتی نەك بۆ گۆڕانی ئەم واقیعە بۆ واقعێکی ناخۆشتر.

لەوەو دوامشتومڕ لە سەر (کاریگەربوون بەڕۆڵە نموونەییەکان) وهۆی سەرەکی لەبەهانەی دامەزراندنی پەسەندکراوبەم شێوەیە: زۆربەی ژنان ژنی ماڵەوەن ئەگەر هاندەرێك نەدۆزنەوە بۆئەوەی ببن بەوژنە کرێکارانەی کەلەڕێگەیەوە هەندێ ئیمتیازاتی تایبەتیان لەکارەکەیان دا پێ ببەخشرێت, ئەوا هەست بەئارەزوویەك ناکەن بۆ کارکردن لە دەرەوەی ماڵەکانیان دا، بەتەنیا وابەستەی ڕۆڵی تەقلیدی دەبن وەکو ژنی ماڵەوە، ونەبوونی پاڵنەرێك مەسەلەیەکی دەروونییە. ژن هەست بەوە دەکات کە

ئەو تەنها بۆ ئەوە دروست بووە ببێتە ژنێك ودایك وئەوانەی دەوربەریشی هانی دەدەن بۆ ئەوە، خۆیشی لەوە زیاتر بیر لە هیچی تر ناکاتەوە (وەکو ئەوەی ژنێکی کرێکار بێ) هیچ ڕۆڵێکی دیکەی لەبەردەمدا نیە قسەی لێوە بکات و ناتوانێ لەم گرێیە دەرونیە رزگاری بێت. وبەڵکو هەر بەخەفەکراوی دەمێنێتەوە. بەهانەی پەسەندکردن لە دامەزراندن بۆ ژنان پشت بەوە دەبەستێ بەوەی ژنان زیاتر لەدەرەوەی ماڵ کاربکەن، بەمەش ڕۆڵی نموونەیی دەگێڕن تا وەکو تەواوی ژنانی کۆمەڵ چاویان لێ بکەن و بەدوایان دا بڕۆن و بەمەش دەرونیان لە و وەستاویەی ڕابردوو ڕزگاری دەبێت و ژمارەیان وەکو فەرمانبەر زیاد دەکات.

لێرەدا ڕەنگە بپرسین: ئایا ژنان دەتوانن بگەنە ئەو لێهاتوویيە گرنگە بەتەنیا گەر هەلی کارکردنیان بۆ ڕەخسا؟ بێگومان گۆڕان بەکت و پڕی ڕوونادات، بەڵکو گۆڕان پێ بەپێ ڕوودەدات، کاتێك کە ژنان دەبینن خەڵکانی تر گەیشتنە کارو ئابوریەکی سەربەخۆ و لە میانەی ئیشکردنیاندا لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ئازاددەبن و، کاریگەریان دەبێت لەسەر دەوروبەری خۆیان . ژنان لە کۆمەڵدا وەکو هەمووان ئامادەدەبن بۆ خوێندن و وەرگرتنی هەموو جۆرە شارەزاییەکی پێویست بۆ دەستکەوتنی توانای پێویست بۆ ئیش کردن، لەو حاڵەتەشدا پێ بە پێ دواکەوتوویی کەم دەبێتەوە و ڕێگا بەرەو پێشکەوتن دەست پێ دەکات.

دواکەوتوویی بۆ بێ بەش بوون لەڕابردوودا دەگەڕێتەوە بۆ بێ توانایی لە بەدەست هێنانی شارەزایی، کە ئەویش لەبەر ئەم چوار هۆیەیە:

**یەکەم** / نەبوونی هەل بۆ خوێندن،

**دووەم** / نەبوونی سیستمێکی خۆراکی گونجاو لە تەمەنی منداڵی و گەنجێتی دا کە کار لە پێگەیشتنی مێشكو زەین دەکات و دەبێتە کۆسپ لەسەر توانای وەرگرتنی شارەزایی زەیینی.





**سێیەم** / کەمی (هاندان) بۆ بەدەست هێنانی زانیاری لە مەڕ تاك. کاتێ کە هیچ سودێك بەدوایەوە نابینن ((سەبارەت بە ژنان ئەوە ڕوودەدات ئەویش هۆکەی جیاکاری ڕەگەزیە.

**چوارەم**: فشارە دەرەکیە دژەکان ڕۆڵێکی کاریگەر لە قۆناغی منداڵێتیدا دەبینن و هێزی ئیرادە لەلای تاکەکان بۆ وەرگرتنی شارەزایی لەناودەبات(8).

ئەم چوار هۆیە کاریگەریەکی زۆری لەسەر بارودۆخی ژنان لە کۆمەڵی بەنگلادیش دا هەیە(9).

پاساوی سوودمەندی کۆمەڵایەتی، داوا دەکات لەگۆشە نیگای جیاوە سەیری کێشەکان بکرێت بۆ ئەوە بدۆزرێتەوە و پشت بە پرەنسیپی سوودمەندانە ببەستێت ئەم بەهانەیە دەڵێ: دانانی کۆتا لە پەسەندکردن لە دامەزراندنی ژنان بەخێرو قازانجی هەموو کۆمەڵ دێتەوە(10)، ژنان نیوەی کۆمەڵ پێك دێنن، ئەگەر نیوەی کۆمەڵ دواکەوتوو بێ ئەوا کۆمەڵ بەگشتی پێش ناکەوێ، پێشکەوتنی ژنان بەشێکە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، کۆمەڵ وەکو گیانلەبەرێك وایە، ئەگەر بەشێکی ئەو گیانلەبەرە ئیفلیج بوو یان ڕۆڵی کزبوو، یا بەواتایەکی تر ئەگەر بەتوانای تەواوی ڕۆڵی خۆی نەگێرا. ئەوا کۆمەڵ بەگشتی و تەواوی دوا دەکەوێ.

لێرەدا هەندێ پرسیار سەر هەڵ دەدەن: ئایا بەڕاستی ژن لەڕابردوودا ستەم لێکراوبووە ؟ بۆچی پیاوان ئێستا ستەمیان لێ دەکرێ وەك پێشتر لەبەرانبەر ژنان ڕوویدەدا؟ ئەگەر وا دابنێین ژنان زوڵمیان لێکراوە و چەوساونەتەوە ئەمەش لە ڕووی پڕەنسیبی یەکسانی، وەڵامی پرسیاری دووەم لە (ج – ی، مۆور – moore) ەوە دێ لەسەر بنەمای پڕەنسیپی سوودمەند بۆ بەهانەی سزادان.

(مۆور) کە باوەڕی بەپڕەنسیپی (یەکەی ئۆرگانیزمی) هەیە دەڵێ: لێرەدا شەڕێکی گەورەتر هەیە لە کۆمەڵ ئەویش (تاوان)ە , ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سەیری بکەین ئەو تاوانە بکەین بە کارێگەری چاکە وخراپە رەنگە بمانگەیەنێتە رەگەزێکی تر کە کەمتر شەڕی تێدا بێت

کاتێ ئێمە بەدوای بەهاناکانی مۆوردا دەگەڕێین ئەو ئەنجامە دەبینین:
((بەدانانی بەشی کۆتا بۆ ژنان ,هەندێ لە پیاوان لە ئێستادا زەرەرمەند دەبن ,بەڵام ئەوە لەکاتێکدایە کە زۆربەی ژنان لە رابردوودا زیانیان لێکەوتووە و تا ئێستاش هەر زیانیان لێدەکەوێ کەواتە پەیرەو کردنی سیستەمی ڕێژەیی بە گوێرەی ئەوبنەماچاکسازیە کە دەڵێت : زەرەرمەندبوونی بەشێك لە زەرەرمەند بوونی گشت یان زۆرینە باشترە ((.(11).

ئێستاش باس لە چوارەمین پاساو دەکەین کە کامڵبوونە. هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە بگاتە پلەی کامڵبوون ، واتە بۆ پێگەیشتنی تەواوی تواناکانی بەڵام جیاکاری لەسەر بنەمای ڕەگەز لە هەموو جیهاندا بەپلەیەك کەمتر یا زیاتر ڕوودەدات، هەروەها لەبەنگلادیشدا، بەهۆی بوونی سیستمی باوك سالاری کە ژن تیایدا لەو مافانەی کە دەیگەیەنێتە کامڵبوون بێ بەش دەکرێ، ئەگەر ڕێگە بە ژن بدرێ دابمەزرێ لە کارێکدا لە ڕێگەی تێوری قەرەبووکردنەوەوە ,هەل لەپێشیدا دروست دەبێ بۆ پێگەیشتنی کەسێتی و توانای هزری وئەو کاتە ژنیش هەموو توانا و کەرەستەیەکی کە بۆ مرۆڤی پێشکەوتوو و کامڵ ڕەخساوە، دەدۆزێتەوە(12)، بەوەش شەڕانگێزیەکانی ڕژێمی باوك سالاری لەناودەبەین و ئەو کۆمەڵە لە شەڕانگێزی رزگاری دەبێت، وایلێدێ پشت بە دارایی خۆی ببەستێت و هەلی بۆ دەرەخسێت بۆ پێشخستنی خۆی و تەواوی تواناکانی. بەم ڕێگەیە ژنان لەگەڵ پیاواندا وەکو یەك دەبن، لەتەك یەکتر، بۆ هاندانی پێشەوەچوونی مرۆڤایەتی هەمووشیان بۆ پێشکەوتنی تواناکان بۆ گەیشتن بەکامڵی ,تێدەکۆشن .



پێویستە پێش ئەوەی بگەینە هیچ ئەنجامێك لەونوسینانەی پێشوو، وەڵامی ئەم پرسیارە گرنگە بدەینەوە کە لە سەرەتادا پێشکەشمان کرد، ئایا ناکۆکی لە نێوان داخوازی کۆتا بۆژنان وداخوازی یەکسانی لەنێوان ژن و پیاوداهەیە ؟ ڕەنگە بڵێین، ناکۆکی لۆژیك نیە لەنێوان مانای دوو ووشە بەکارهاتووەکە ,بەڵام پێویستە لە واقیعیەتی هەردووداخوازیەکە بکۆڵینەوەو ببینین ئایا ناکۆکیان هەیە؟ .....یەکەم داواکاری دامەزراندن و دانانی سیستەمی ڕێژەیی و دووەمیش داوای یەکسانی، ڕەنگە لەونێوەدا بڵێین یەکسانی لەمیانەی کێبڕکێی ئازاددا جێ بەجێ دەبێت بەڵام ژنان لە دۆخێکی لاوازتردان، ئەمەش کێبڕکێیەکی هاوتاو دروست نابێ بۆژنان، چارەسەریش (دامەزراندنی پەسەندکراوە). کاتێ کە داوا لە پیاو دەکەین ئایا زیاتر داوا بکەین؟ لەبەر ئەوەی پیاوان زیاتر خاوەنی مافەکانی خۆیانن لەچاو ژنان، پێویستە زیاتر تێ بگەن و خەمخۆری مەسەلەکە بن و، دەست بەرداری داواکانیان بن تاکو ژنان قەرەبووی ئەو ستەملێکردنەیان کە لە ڕابردوودا بەسەریاندا هاتووە, بکرێنەوە؟ ئەوە ئێستا وا بە ئاسانی مەیسەر نابێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا , لەژێر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانەی لەبارەی پێشکەوتنی مۆراڵیەوە باسکران ,ڕەنگە ئەوە بێتەدی.

داواکردنی یەکسانی نموونەیەکی بەرزە و ئەوەش بەهۆی کۆمەڵێك ئامرازەوە جێبەجێ دەبێ, لەوانە : دامەزراندنی پەسەندکراوی بەشی ڕێژەیی کە بۆ ژنان دانراوە، گومان یاخود گلەییەکانی (ناکۆکی بوون) ناهێڵێتەوە ئەگەروامان دانا ئەوەی باسمان کرد کارێکی چاکە هەم وەکو خۆی وەك ئامانجێك و دواتریش وەکو ئامرازێکی چاك. دەتوانین ئەو بەهانانەی پێشوو جێبەجێ بکەین کە پاڵپشتی تێوری قەرەبووکردنەوە لە جیاکاری دەکات لەسەر توێژی چەوساوەی پیاوانی نێو کۆمەڵگە، مرۆڤ ڕووبەڕووی چەوسانەوەو جیاکاری دەبێتەوە لە هەموو جیهاندا. بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەز وەکو جیاکاری مەزهەبی و خێڵەکی و کەمە نەتەوایەتی (لێرەدا جیاکاری ڕەگەزی بەهەند وەرناگیرێ) بۆ نموونە با

سیاسەتی جیاكاری ڕەگەزی لە باشووری ئەفەریقیا بەبیر خۆمان بێنینەوە یاخود ئەو سیاسەتەی بەرانبەر ڕەش پێستەكانی ئەمریكا هەیە، ئەگەر قوربانیەكە ژن بێ ئەوا هۆیەكی تریش زیاد دەبێ ئەویش جیاكاری ژەندەریە،بەو مانایەی (ژنی ڕەش پێست، ڕەش پێستەو ژنیشە لە هەمان كاتدا و بەهەردوو هۆكارەكە دەچەوسێتەوە). سەرباری ئەوەی لە هەندێ شتدا لەگەڵ پیاوان جیاوازن، ژنان بەرەو ڕووی جیاكاری دەبنەوە ئەمە لۆژیكە، هەڵەنیە ئەگەر داوابكەین بۆ (بنكە ئاستێك) دابنرێ لە گۆشە نیگای لیبرالی و كراوەیی‌دا. بە ئامانجی پارێزگاریان لەو چەوسانەوە فرەییە. هەڵەنیە ئەگەر باوەڕمان بەوەبێ كە زیان لەجێ بەجێ كردنی (بنكەی لیبرالیەت) ڕوونادات لەم بارەوە، نیوەی كۆمەڵ پێش دەكەوێ لەبواری ڕۆحی و بایەلۆژی و ئابووری دا. لەبارەی كۆمەڵایەتیەوە تەنها توێژێكی دیاری كراو یاخود لە بازنەی خێزاندا سوومەند نابێ. لە هەموو دیانەتێك و فرە ڕەگەزێكدا نیوەی كۆمەڵ لە ژنان و نیوەی تر لە پیاوان پێك دێ بەبێ لەبەر چاوگرتنی هەژارو دەوڵەمەند، لەبەرئەوە ئەگەر بینیمان بیرۆكەی بەشی ڕێژەیی پەسەندكردن لە دامەزراندنی ژنان دوا كاریگەری لەسەر بەرژەوەندی پیاوان دایە، ئەوا لە كۆمەڵی مرۆڤایەتی دا هیچ زیانێك لەبەرژەوەندی گشتی ڕوونادات ئەگەر ژن لەوەزیفەدا كارێكی كرد، ئەوا خێزانەكەی لە ڕووی ماددی و ڕووەكانی تریش سوود وەردەگرێ، وای لێ دێ ژنان وشیاری زیاتریان لەسەر ژینگە دەبێ و كاتێ كە دەگەنە خوێندن و شارەزایی پەیدا دەكەن بەوەش شارەزایی زیاتر لە ژیانی ڕۆژانەیان دا پەیدا دەكەن، پشت بەخۆیان دەبەستن و لەسەر ئاستی كەسێتییان كاریگەری دەنوێنن. بێ گومان دایكانی خوێندەوارو پشت بەخۆ بەستووش بۆ نەوەكانی داهاتوو ئەبن بەنیعمەتێك نەك لەعنەتێك.



## تێبینیو سەرچاوەكان

1–جۆرج شێیر (پاساوی دامەزراندن بە مەبەستی قەرەبووكردنەوەی جیاكاری) فەلسەفە گشتیەكان 4, ژمارە (1975) لاپەرە 164.

2– دۆزی ژنان (كۆمەڵەی ژنان بۆ توێژینەوە سەبارەت بە ژنان ) دەككا (1979) لاپەرە 335.

3– بڕوانە م.ئا.واڕن, جیاكاری سێگسی لاوەكی دامەزراندن بە سیستمی پشكی رێژەی فەلسەفەو گشتیەكان 7, ژمارە 2 (72–1971) لا251 و دوایش.

4– لەوجۆرە پۆلێن كردنە بۆ نموونە (ئاین, ئەتنی , ژێندەر , ناوچە ,...هتد لەبەرچاوبگیرێ

5– بانگەشەكەرانی ئوسوڵیەكان لەبەنگلادیش لەبارەی جیاكاری بنەرەتی لە سێكسدا بە راشكاوی دەدوێن و ئەوانەی بانگەشەی لیبرالیەتیش دەكەن بە جیاكاریەكی لاوەكی دەیبینن.

6– ئەم توانجە جۆرە حكومەتەكانی دەوڵەتە ئیشتراكیەكان ناگرێتەوە .

7 –بڕوانە ج,ح تۆمۆن1 دامەزراندنی تفصلی , فەلسەفەو –گشتی (2) ژمارە 4, (1973) لا 38.

8– بڕوانە ج شێیر لەكاری ناوبراو لا 165.

9– بڕوانە ا.ب. روقیە , ژنو هۆیەكانی راگەیاندن لە بەنگلادیش , لەو كتێبەو ب,ب, روقیە , دۆزی ژنانی بەنگلادش لەئەفسانە میللەكاندا .
ج–دۆزی ژنان لە كتێبی ناوبراودا .

10– ج,ئا, وێنە,بنەما ئەخلاقیەكان ,بەشی 6 , كامبریدج(3–19).

11– بڕوانە ب, روقیا (ئا وێنەكان لەسەر بنەمای سودگەیاندن بەندن لێكۆڵینەوەی زانكۆی دەككا لە دیسەمبەری 1987.

12- بڕوانه ,ب, روقیا (ژن له کۆماری ئەفلاتونی نموونەییدا) (بەزمانی بەنگلادیش نوسراوه ) دەککا, فسفا پریلا پاتریکا, دیسەمیەری 1980.



# ژێدەرەکان

***ژێدەرە گشتیەکان :***

1- رێبەری سەرچاوەکان سەبارەت به دۆخی ژنان , یونسکۆ 1982.
2- سەرچاوەیەك لەسەر ژنانی بەنگلادیش , دانانی (مەحمودە ئیسلام) دەکا 1979
3- بزاڤی ژن و سیاسەت , دانانی ، (A.philips) ئۆکسفۆرد1987.
4- توێژینەوەکان لەمەڕ دۆخی ژن, باڵی پێشکەوتن و نیشتەجێ بوون له ئاسیا, سەرچاوەیەکی راڤه کراوی (کیمی هارا ).
5- ژیانی کۆمەلآیەتی ژنان لەسەرەتاکانی چەرخەکانی ناوەراست لەبەنگالیا , دانانی شەهناز حوسێن, دەککا. 1985.
6- ژنانی هاوچەرخی عەرەبی ,(سەرچاوه) (Michello racagni) دانانی ملیکلۆ راکاگنی،لەندەن 1978.
7- ژن له چین , دانانی کارین ت .ویی(Karen.t.wei) لەندەن 1984
8- ژنان لەمەیدانی هیندا (Kalpan Dasgupta) نیودەلهی ,1976.
9- ژن و سیاسەتی دەوڵەت , دانانی (عەبدولا نرعێنی .سەنگافوره 1989.
10- ژن و کۆمەڵگا , (Rosenberg) (Bergstrtrom) لەندەن 1975.
11- ژن له باشوری ئاسیا , دانانی (Carol sakala) نیۆیۆرك(1980). کارۆل سکالا
12- دۆزی ژن , کۆمەڵەی ژنان بۆ لێکۆڵینەوەی ژنان , دەککا 1979.

### ژن و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لە بەنگلادیش :


1- ت,بلانکیت،((ژن و پیسبون و پەراوێزبوون)) ماناو ڕەوشتی مناڵبوون لە لادێکانی بەنگلادیشدا , دەککا 1984.

2- ئا, کبیر , فلیم لە بەنگلادیش , دەککا 1979.

3- کتێبی گیرفان ئامارێکی بەنگلادیش ,دەککا (1984-85) .

4- دۆزی ژن , کۆمەڵەی ژنان بۆ لێکۆڵینەوەی ژنان , دەککا (1989).


### بنەما مۆڕاڵەکانی ژن لە ئیسلامدا :


1- علی م , نامیلکەیەك لەبارەی فەرموودوکان.

2- علی م . (ئاینی ئیسلام) هند 1973.

3- علی م . شەریعەتی ئیسلام لەهاوسەرگیریو جیابونەوەدا , هیند .

4- علی ئا,ی (مانا لە قورئانی پیرۆزدا , هیند .

5- بیلی , کورتەیەك لە یاساکانی موحەمەدی , هیند 1965.

6- باڤیجا , ح, ( ژن لە ئیسلامدا , هیند.

7- بوخاری , کتێبی زانستی .

8- فیزی (کورتەیەك لەیاساکانی موحەمەدی ) هیند 1964.

9- حمید ئەڵلا ,م بەرێوەبردنی دەوڵەتی ئیسلام, لهور 1984.

10- (بنەماکانی شەریعەنی ئیسلامی ) بەمبی 1968.

11- شکاکت ,ج (Schacht. .J) لەندەن 1961

12- وێلس (یاساکانی ئینگلیزی موحەمەدی) , لەندەن 1920.




### بارو دۆخی ژنانی بەنگلادیش لە ئەفسانە میللیەکاندا :


1- دەی ,ل,ب (Day.l.B) چیرۆکە میللیەکانی بەنگالی , لەندەن 1921.

2- ئەفسانە میللیەکانی بەنگلادیش , ئەکادیمیا , بەنگلا, دەککا, 1985.

3- (Loko shitya somkalan) ئەکادیمیا , بەنگلا , دەککا 1985.

4- د.س. کاکاتا, (senD .C.) ئەدەبی میللی بەنگالی , کالکاتا , 1920.

5- د.ن.کنارام (konavm)1923.

6 - تۆمسۆن هۆڵت (Thowson 8 Holt), نیویۆرك .


### بیجوم ڕوقیە_ ڕابەری هزر خوازی:


1-بیجوم ح , بنەما مۆڕاڵەکان لەلای مۆور_ MOUR , تیۆرو پراکتیك , زانکۆی دەککا , 1982.


### ژن لە کتێبی سەوزی قەزافییدا :


1- کۆنگرەی جیهانی لە بەنخازی , کتێبی سەوز, بەرگی , تریبۆلی , 1979.

2- موعەممەر قەززافی , کتێبی سەوز . تەرابلوس , لیبیا.


### پەیوەندی ژن و پیاو لە ئەدەبی هاوچەرخی بەنگلادیشدا :


1- علی جاترا, (jatra) .دەککا .

2- علی س, پریم کاهینی (prem kahini) دەککا .

3- ئـەدەبی هاوچـەرخی بـەنگلادیش , کۆکردنـەوەی کۆمـەڵێك وتـار (بـەزمانی ئینگلیـزیو بـەنگالی لـەژێر چاپدایە , کۆمەڵـەی بـەنگلادیش ئاسیایی , دەککا .

4-حەق,ح,ئا (Patale Haspatale) دەککا .

5- حەق,ح,ئا , نامهین گۆترۆهین (Namhin gotro hin) دەککا .

6- کەریم, (Amar jata glani),دەککا.

7- کەریم, (Pream etki Lal golap), دەککا.

8- وەلی ئەڵلا, (Ama Bashr chamdo) دەککا.

9- وەلی ئەڵلا, (kando NaDi kando) دەککا.

### ڤێرجینیا وۆلف و ئازادکردنی ژنان :

1- بل, ك ڤێرجینیا وۆلف , ژیانی , لەندەن, 1964.

2- فۆستەر. ئا , م ڤێرجینیا وۆلف , کامبریدج 1943.

3-جۆمستۆن (Johmstone,J.k) کۆمەڵەی پلوفربری نیۆیۆرك 1954. ح,ك,

4- ناسان,م, (Nathan M.) ڤێرجینیا وۆلف, لەندەن 1961.

5- وۆلف, ڤێرجینیا, ژوریکتاییەت بە خۆمان , لەندەن 1929.

6- وۆلف,ڤ,سێ جونەیهی , لەندەن (1938).

7- وۆلف, ڤ,ئۆرولاندۆ , لەندەن 1928.

### سیستمی بەشی ڕێژەی دامەزراندن لە بەنگلادیش:

1- بیجـوم حەسـنە , ژن و کەناڵـەکانی راگەیانـدن لەبـەنگلادیش لەهـەمان کتێب دا .

2- د.بیجـوم حەسـنە . بـارودۆخی ژنـانی بـەنگلادیش لـە ئەفسـانە میللییەکاندا لەهەمان کتێب.





3- بیجوم ح . (ئایا تیۆری مۆور لەسەربنەمای سودمەندبوون بەندە ؟) لێکۆڵینەوەکانی زانکۆی دەککا, دیسەمبەری 1987.

4-(Bisvabidg laya Patrilla) بیجوم .ح, ژن لە کۆماری نموونەییدا ئەفلاتوون , دەککا دیسەمبەری 1980.

5- مور,ح,ئا,بنەما ئەخلاقیەکان. بەشی چوارەم , کامبریدج (1903).

6- شـیر,ح, (بەهانـەی دامەزراندندابۆقەرەبوکردنـەوەی جیاکـاری) فەلسەفەی گشتی .4,ژمارە 2 1975.

7- تۆمسـۆن, ج,ج,(دامەزرانـد.....فەلسـەفەی گشـتی .2, ژمـارە 4. (1973).

8 – وارن.م,ئا,(جیاکاری سێکسی لاوەکی و دامەزراندنی پشکی ڕێژەیی فەلسـەفەی گشـتی,ژمـارە 2(1972–1971). لاپـەرەکان ( 100, 101, 102,103 )

## پێرست

# کۆتایی